# جگەرخوێن

# مەشخەڵێ لە تاریکیدا




ڕۆڤار

37




بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە و هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێک

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دوو مانگ جارێک دەریدەکات





## هێڵکاری ئەم ژمارەیە

بۆ هێڵکارییەکانی ئەم ژمارەیە سوود لە بەرهەمە بڵاوکراوەکانی هەردوو هونەرمەندی کورد (ڕەفۆ سنجاری و بەشار ئەلعیسا) وەرگیراوە

---

# ژمارەکانی ڕابردوو

٧

ئیبراهیم ئەحمەد، محەمەد مەولود (مەم)، کەمال مەزهەر، لەتیف حامید، سوارەی ئیلخانی زادە، محێدین زەنگەنە، ئەحمەد هەردی، یەڵماز گۆنای، ئیسماعیل بێشکچی، موحەرەم محەمەد ئەمین، دڵدار، مەستوورەی ئەردەڵانی، مەولانا خالیدی نەقشبەندی، بەسال عیر-ن. مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، جەلالی میرزا کەریم، عەبدولخالق مەعروف، هێمن، حسێن حوزنی موکریانی، ئەمین فەیزی، کامەران موکری، جەلال تەقی، حەمە سالح دیلان، هەژار، شاکیر فەتاح، کاکەی فەلاح، عەلائەدین سەجادی، شێخ محەمەدی خاڵ، حسێن عارف، عەلی ئەشرەفی دەروێشیان، سەلیم بەرەکات، پێشەوا قازی محەمەد، مەحمود مەلا عیززەت، فایەق بێکەس، عەبدوڵڵا پەشێو.

---


سەرپەرشتیاری گشتی

شێرکۆ بێکەس

ڕاوێژکار

ئەکرەم قەرەداخی

سکرتێری ڕۆڤار

یاسین عومەر

سەرپەرشتیاری هونەری

قادر میرخان

مۆنتاژی کۆمپیوتەر

یادکار ئەوڕەحمان

سەرپەرشتیاری چاپ

فەرهاد رەفیق

(ڕۆڤار) بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێک، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دوو مانگ جارێک دەریدەکات



ناونیشان

سلێمانی - فولکەی یەکگرتن

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

ت: ٣١٢٩٦٠٩

لە دەرەوەی وڵات

Tel: 00441628477660

Fax: 00441628486008

Web Site

www.sardam.info

Email

Sardam@sardam.info



.چاپخانەی (ڕەنج)

# سەردەمنامەی جگەر خوێن

شکۆ تۆفیق



جگەر خوێن ناوی شێخموس حەسەن عەلیە و ساڵی 1903 لە گوندی هەسری هاتۆتە دنیاوە. باوکی جگەرخوێن لە هەسارییەوە کۆچی کردووە بۆ عامودا و لەوێ نیشتەجێ بووە. دوای ماوەیەك لە عامودا (باوکی دەمرێ) و پاشانیش (دایکیان) کە ناوی عێشانە بوو دەمرێ. بۆیە ژیانی منداڵی جگەر خوێن دەکەوێتە ئەستۆی براکەی (خەلیل) و خوشکەکەی (ئاسیا).

لە تەمەنیی هەرزەکاریدا جگەر خوێن گوندە کوردنشینەکانی خۆرئاوای کوردستان گەڕاوەو دوایی ڕوودەکاتە کوردستانی باشوور و ماوەیەك دەمێنێتەوەو ئینجا دەپەڕێتەوە بۆ کوردستانی خۆرهەڵات و لە گوندی (گردەشێر) دەمێنێتەوە هەر لەوێش درێژە دەداتە خوێندنی توێژینەوە ئاینییەکان لەلای شێخ عوبەیدوڵلا و دوای ئەویش لەسەر دەستی ئیمام فەتحوڵلا و هەر بە گەنجێتی شەهادەی (ئیجازەی زانستە ئاینییەکان)ی پێدەبەخشرێ.

بە ماوەیەکی کەم لە ناو کوردستاندا دەنگی شیعری جگەرخوێن بڵاو دەبێتەوە، دیوانەکانی پەخش دەبن، لەپاڵ شاعیرە بەناوبانگەکانی کوردی باکوردا ناوی دەهێنرا.

لەساڵی 1950 وە کەوتۆتە چالاکی سیاسی و بوەتە لایەنگرێکی حیزبی شیوعی سوری. پاشان بەشداری کردووە لە دامەزراندنی حیزبی (ئازادی)دا. بەڵام کاتێ (حیزبی دیموکراتی کورد) لە سوریا دروستبوو چووە پاڵیان و ئەندامێتی کردووە تا لە ساڵی 1958 دا بووەتە ئەندامێکی لیژنەی مەرکەزی ئەو حیزبە.

جگەر خوێن لە زۆر بواردا نووسینی هەیەو زیاتر لە 37 کتێبی ئامادەکردووە گرنگترینیان (مێژووی کوردستان)ە کە بە دوو بەش بڵاوکراوەتەوە. هەشت دیوانی شیعری هەیە (ئاگرو کڵپە 1945، شۆڕشی سەربەخۆیی 1954، کینەم 1973، ڕووناك 1981، زەندا ڤێستا 1981، کازیوە (شفق) 1983، هێڤی 1983، ئاشتی 1983). ڕۆمانێکیشی نووسیوە بەناوی (ڕەشوداری) یەوە لە بواری زمانەوانیشەوە (فەرهەنگ) ێکی کۆکردۆتەوە. هەروەها لە بواری فۆلکلۆرو کەلەپوریشدا نووسینی هەیە.

پاش مردنی جگەر خوێن منداڵەکانی کۆمەڵێك بەرهەمیان بڵاوکردۆتەوە لەوانە (یاداشتەکانی)یەتی.

ڕۆژی 22/ ئۆکتۆبەری 1984 لەوڵاتی سویدەوە تەرمەکەی بە کەژاوەیەکی شکۆدارو پڕمەزنییەوە گواسترایەوە بۆ گۆڕستانێ لە قامیشلی و لەبۆنەیەکی ڤێستیڤاڵانەی کەم وێنەدا کە جەماوەری ناوچەکەو کوردانی دڵسۆزی شیعر و ئەدەب و کوردایەتی ئامادەی بوون لە جێنزرگەیەکدا بەخاك سپێردرا کە ئێستا بووەتە مەنزڵگەی بۆنەو ئاهەنگە نیشتمانییەکان و بزاڤە ڕووناکبیرییەکانی کوردستان.

# (جەنگی جیهانی یەکەم) کۆتاییهات

ئیمپراتۆرییە مەزنەکانی شەڕ ڕوخێنران لە ناویاندا ئیمپراتۆریەتی عوسمانی یا باشتروایە بڵێین (دوا خەلافەتی ئیسلامی).

ئەو میللەت و نەتەوانەی ژێر دەستەی ئەم ئیمپراتۆریەتەش بوون هەلێکی باشیان بۆ ڕەخسا هەوڵی جیابوونەوەو سەربەخۆیی بدەن و لەژێر ڕکێفی خەلیفەی عوسمانیدا نەمێنن.

دامەزراندنی (کۆمەڵەی گەلان) و ئیعلانکردنی بیروڕا مرۆڤدۆستانەکەی (ویلسن)یش کە دەڵێ "گشت نەتەوەکانی جیهان مافی چارەی خۆنووسینیان هەیە" بەهێزترین کاریگەربوون بۆ ڕزگاری ئازادی گەلانی ژێر دەستە لە جیهاندا و گەلانی ناوچە بەرفراوانەکەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بەتایبەتی لە لایەك و لەلایەکی دیکەوە نێوان (سەرکەوتوان و دۆڕاوان)ی جەنگەکە کۆمەڵێك پلان و پەیماننامە مۆرکران. بەو پێیە خاك و نەتەوەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستیش بەر شاڵاوی ئەو پلان و پەیماننامانە کەوتن و بەپێی بەرژەوەندی وڵاتە سەرمایەدارەکانیش نەخشەی ناوچەکە گۆڕرا بێ ئەوەی هیچ حسابێ بۆ گەلانی ناوچەکە بکرێت.

نەتەوەی کوردیش یەکێك بوو لەو نەتەوانەی لەژێر دەسەڵاتی عوسمانیدا دوچاری چەوساندنەوە و ئەشکەنجەو ئاوارەیی ببوو. هەر بۆیە بەڕووخاندنی ئەو دەسەڵاتە ڕووناکبیران و سیاسەتمەداران و سەرەك خێڵانی کورد لەدەرەوەو ناوەوەی وڵات کەوتنە خۆو هەوڵیاندا ئەو هەلە بقۆزنەوە تا سەربەخۆیی گەلی کورد و کوردبوون ڕابگەیەنن. (شۆڕش)ی ناوبنرێ یا (ڕاپەڕین) گرنگ ئەوەیە بۆ یەکەمجار بزووتنەوەی ڕزگاریخوازانەی چەکدارانە لەناوچەی باکووی کوردستاندا هەڵگیرساو لە هەمووڵایەکانی تری کوردستانەوە بە هانایانەوە چوون و بوونە پتەوترین پەناو پاڵپشتی شۆڕشگێڕان. سەرەتا سەرکەوتن خۆراکی ڕۆژانەی شۆڕشەکە بوو، ئەو بزووتنەوەیەش بووە مایەی خۆشحاڵی هەموو بەشەکانی دیکەی کوردستان، بە درێژایی مێژووی ئەم گەلە بۆی سەلمێنراوە کێشەی سەربەخۆبوون و ئازادی خاکی کوردستان لە ئەستۆی کورد خۆیدایەو نابێ چاوەڕوانی پلان و پەیماننامەی دەوڵەتە زلهێزو سەرمایەدارەکانی جیهان و حوکمڕەوایانی ناوچەکە بێت. چونکە ئەوەی لەم خاکە ڕوویدا و بینرا بە بەرچاوی نوێنەری کۆمەڵەی گەلان، وڵاتە دیموکراتیخوازەکانی ئەوروپا، دەوڵەتی سۆڤێتی (قەڵای سۆشیالیزم)، هەموو مرۆڤدۆستان و مافپەروەرانی جیهانەوە نەبوونە ڕێگرێك، تەنانەت بێ گوێدانە شەرعیەتی نێو دەوڵەتیانەو مرۆڤانەی گەلان هەرچی شۆڕش و ڕاپەڕینێك هەڵگیرسابێ بەزەبری چەك و سوپای بێ بەزەیی دادەمرکێنرانەوەو گوندو شار دەڕوخێنران و خەڵکەکەشی ئاوارەی دەشت و شاخ دەکران.

(سەرمایەدارانی جیهان) بۆ گەیشتن بە مەرامیان و بەپێی پەیماننامە شوومەکانیان ناوچە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستیان پارچەپارچە کرد. دەرئەنجام خاکی کوردستانیش دابەشکرا، باکووری کوردستان کەوتە ژێر دەسەڵاتی حوکمڕانیی (کەمال ئەتاتورک)ەوەو خۆرهەڵاتی کوردستان بەپێی پەیماننامەیەك لەژێر سایەی شاهی ئێراندا مایەوەو باشووریش خرایە سەر ویلایەتی مەلیکی عێراق و خۆرئاواش بەوڵاتی سوریای ژێر ئینتیدابی دەستوورییانەی فەرەنسییەوە لکێنراو هەتا ئێستاش بەو شێوەیە ماونەتەوە.

گەلێ هاندەرو هاوکار هاتنەکایەوە کە گەلی کورد لە بزوتنەوەی ڕزگاریخوازانەی خۆی نەوەستێت و بەردەوام بێت لە دژایەتیکردن و بەگژاچوونەوەی هەموو داگیرکارییەك لەوانە -کۆتاییهاتنی جەنگ و دەرئەنجامەکانی، پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا لە هەموو بوارەکاندا، سەرهەڵدان و سەرکەوتنی شۆڕشی سۆشیالیزم لە ڕووسیاو وڵاتانی دەوروبەری، بڵاوبوونەوەی فەلسەفەی نوێخوازانەو ئایدیۆلۆژیاو داهێنانی نوێ، بڵاوبوونەوەی بیری سۆسیالیستی و بێبەهاکردنی بیری ئایدیالیستیانە، بێ بەهاکردنی بیروکاری ئاغا و شێخ و بەگ و مەلاو گشت چەمکە خێڵەکییە دواکەوتووەکان، گەشە پێدانی بیرو توانای لاوانی پێشکەوتوخواز، بڵاوبوونەوەی بیری شۆڤێنیانەو فاشیستیانە لە هەندێك وڵاتی پیشەسازیدا، دابەشبوونی جیهان بەسەر دوو سەربازگەی زلهێزو بەتوانادا، هەڵگیرساندنی بزووتنەوەو شۆڕشی گەلانی ژێر دەستە بۆ ئازادی و

سەربەخۆیی، ... چەندەها هۆکاری تریش.

پێش هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی دووەم بە ماوەیەك ململانێی نێوان دەوڵەتە سەرمایەدارەکان دەستیپێکرد، جیهانیش بە هەموو کێشەکانییەوە لە گشت بوارەکاندا دەبەسترانەوە بەو ململانێیەوە، لەو کێشانەش کێشەی خاکی کوردستان بوو کە هەر لایەنەو هەوڵیدەدا گەلی کورد و بزاڤە شۆڕشگێڕانەکەی بکاتە سەرەنێزەی مەرام و بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆی.

ئیمپراتۆریەتی بەریتانیا و فەرەنسا (ئەمەریکاش) ناڕاستەوخۆ بوونە پاڵپشت و هاندەری بزاڤە ڕزگاریخوازانەکەی گەلی کورد. بەپێی سیاسەتی ئەوڕۆژە باشترین ڕێخۆشکەربوون بۆ دروستکردن و دامەزراندنی بزاڤ و پارتی سەربەخۆیانەو بڵاوبوونەوەی بیری ئازاد و دیموکراتیانە لە کوردستاندا.

لەکوردستانی باشوردا بەتایبەتی لە شاری (سلێمانی)دا پارتی هیوا دامەزرێنراو بەدەعمی




ناڕاستەوخۆیانەی (بەریتانیا) و بەماوەیەکی کەم بیروڕا و ئامانجی ئەم پارتە ڕێکخراوەییە بەگشت ناوچەکانی کوردستاندا بڵاوبۆوە بەبێ ئەوەی هیچ سانسۆڕێك لەلایەن هیچ دەسەڵاتێکەوە ڕێگری بکات.. زۆربەی جوتیاران و قوتابیان و تەنانەت ئەفسەران و سەربازانی سوپای دەسەڵاتیش ببوونە ئەندام لەو پارتەدا.. هەر ئەم پارتەش بووە ڕێخۆشکەرو بناغە بۆ سەرهەڵدانی ئەو شۆڕشەی دەمێ ساڵ بوو کوردان هەوڵیان بۆ دەدا، لەم کاتەدا مەلا مستەفای بارزان (کە وەك سەرکردەیەکی بزووتنەوەکە ناسێنرا) بەیارمەتی کۆمەڵێك کادێرانی پارتی هیواو هەندێك لە پیاوانی هۆزەکەی توانی (لەئێرانەوە) بگاتە شاری سلێمانی و لەوێوە بپەڕێتەوە بۆ ناوچەی بارزان بە مەبەستی هەڵگیرساندنەوەی شۆڕشی گەلی کورد. دەسەڵاتی سوریا و لوبنانیش کە لەلایەن فەرەنساوە هاندەدران ڕێگرییان نەدەکرد لەو بزاڤ و ڕاپەڕینانەی گەلی کورد لە کوردستانی خۆرئاوادا و سانسۆریان نەهێشتبو ئەوەش بۆ ئەوە بوو ویژدان و هۆشی کوردان بەلای خۆیاندا ڕابکێشن و نەهێڵن بەهیچ جۆرێك ئەو هێز و توانایەی ئەوان لەلایەن نەیارەکانیانەوە بەکاربهێنرێن، بۆیە هەمیشە پێشوازی لە هەموو هەوڵێکی هۆشیارانەو ڕووناکبیرانەی گەلی کورد دەکرا. بۆ ئەم مەبەستەش هانی دامەزراندنی بنکەو دەزگای ڕووناکبیرانەو بزاڤی ڕێکخراوەیی و فێستیڤاڵی جەماوەرییانەو کۆڕو پێشانگەی فۆلکلۆرانەی نەتەوەییانە دەدرا.

چاپکردن و بڵاوبوونەوەی گۆڤاری (هاوار) لە دیمەشق و گۆڤاری (ستێر) و (ڕوناهی) لە بێروت هەروەها دامەزراندنی بەشێك بەزمانی کوردی لە ئێستگەی ڕادیۆی بێروت بە دەنگی (میر کامەران بەدرخان) دەرئەنجامی ئەو گۆڕانکارییانە بوون لە ناوچەکەدا کە لەڕێی ئەو ئێستگەیەوە توانرا بەئاشکرا (گۆرانی و سرود و مۆسیقای کوردیانە) هەروەها وتارو شیعری نەتەوەیی و شۆڕشگێڕانە ڕاستەوخۆ پەخش بکرێن. ئەمانە هەموو بەڵگە نەویست بوون بۆ ئەوەی بەجیهان بسەلمێنرێت نەتەوەیەك هەیە هێشتا ژێر دەستەیە و ئەگەر بۆی بڕەخسێ هەمیشە لە هەوڵدانادایە بۆ سەربەخۆیی و ئازادی.

کوردانی ناوچەکە بەوەوە نەوەستان کۆمەڵێك ڕێکخراوی وەك (کۆمەڵی خۆییبوون) (لاوانی کورد) (دیدەوانی کورد) یان دامەزراندو لە ڕێی ئەو ڕێکخراوانەشەوە نووسەران و زماناسان خەڵکی ناوچە کوردنیشینەکانیان فێری کوردی دەکردەوە و ڕۆحی کوردایەتییان تێدا زیندوو دەکردنەوە. هەروەکو نووسەرێکی کوردی سوریا (نورەدین زازا) لە یادەوەرییەکانیدا دەگێڕێتەوە لە کتێبێکدا بەناوی (ژیانی کوردەواریم) دەڵێ: (گەڕەکی کوردان لە دیمەشق.. گونجاوترین گۆڕەپان بوو بۆ دامەزراندن و پەرەسەندنی بزاڤە ڕوناکبیری و وەرزشییەکان) هەروەها دەڵێ: (لەبواری وەرزشیشەوە یاریکەران کوردایەتی خۆیان دەسەلماند.. بۆ نموونە لە ساڵی 1939 دا تیپێکی تۆپی پێ خۆیان ناونا "تیپی کوردستان" لەکاتی یاریکردنیشا تەماشاکەران بەهتافی "دەی کوردستان.. هێرش بەرە کوردستان.. بژی کوردستان" یاریگایان دەهەژاند. تا لە ساڵی 1940 بە بەشداری کردنیان لە خولی ساڵانەی تۆپی پێی دیمەشق بەیەکەمی پاڵەوانێتیی هەمو تیپەکان بردیانەوە، وەك ڕێکلامیش بۆ ئەو بردنەوەیە لە مانشێت و سەردێڕی ڕۆژنامەو گۆڤارە وەرزشییەکاندا بە هەر زمانێك بوایە دەنووسرا (کوردستانی سەرکەوتوو)، بەڵام بەداخەوە ئەم چالاکییانەی کوردستانی خۆرئاوا دەسەڵاتی تورکیای بێ تاقەت کردو ناچار لەڕێی حکومەتی فەرەنسی و سوریی ئەو کاتەوە گشت چالاکی و بزاڤە کوردییەکان ڕاگیران و قەدەغەکران.

# کەسێتیی جگەرخوێن لەنێوان ڕاستی و داهێنان دا

ن: جوانی عەبدال

و: سەلاحەدین عوسمان

پاش کێشمەکێش و ململانێیەکی توندو تێکشکێنەر، جەنگی جیهانیی یەکەم لەساڵی (1914-1918) بەکۆتاییەکانی گەیشت، بەکۆتاییهاتنیشی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی یان خەلافەتی ئیسلامی و ئیمپراتۆرییەتەکانی نەمساو مەجەرو بولگاریا بەدەستەوەدانی خۆیان راگەیاندو هەڵوەشان، پاش ئیمزاکردنی ئاگربەستیش لەڕۆژی (1918/11/11) لەکۆمبین، هەروەها لەئەنجامی مۆرکردنی پەیماننامەکانی ڤیرسای و سانت جرمین وتریانۆو نیولی و پاش ئەوانیش پەیماننامەی سیڤەر، سنوورەکانی وڵاتانی ئەورووپاو ئاسیا گۆڕانکاریی زۆریان بەخۆوە بینی، کەیەکێك لەو دەرئەنجامانە دروستبوونی کۆمەڵەی گەلان (عصبە الامم) بوو لەپێناو قەدەغەکردنی جەنگ و چارەسەرکردنی کێشەکان.

لەسەر ئاستی ڕۆژهەڵاتی ناوینیش شکستهێنانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی نەك هەر ڕووداوێکی گەورە بوو، بەڵکو کارەساتباریش بوو، ڕاگەیاندنی سەرکەوتنیش لەلایەن هاوپەیمانانەوە (ئینگلتەراو فەرەنسا) ڕووداوێکی کەم وێنە بوو، سەبارەت بەناوچەکەو دابەشبوونەوەی، بەپێی مەبدەئەکانی ویسلۆن، خشتەی دابەشکارییەکانی (سایکس-بیکۆ)و دووبارە داڕشتنەوەی نەخشەی ناوچەکە ئامادەبوو، کەتیایدا ڕایگەیاندبوو: پێویستە گەلان لەبارەی ماف چارەی خۆنووسینیانەوە بەو شێوەیە هەڵسوکەوت بکەن کەئەوکات بانگەشەیان بۆ دەکرد..!.

هەربۆیە سەرجەم گەلانی ناوچەکە، خۆیان بەشایستەی سەربەخۆبوون و ڕزگاربوون لەدەست خەلافەتی عوسمانی دەزانی، لەوانەش گەلی عەرەب و ئەوانی تر، هەروەها گەلی کوردیش لەڕێی نوێنەرانییەوە و داواکارییەکانیان لەبارەی خودموختارییەوە ڕاگەیاندبوو کە لەبەندەکانی پەیماننامەی (سیڤەر) لە(10/ئاب/1920-بەشی سێیەم- ماددەکانی (62 و 63و 64))دا ئەو مافەیان زامنکرابوو.. هەر بۆیە بۆ یەکەم جار کورد هەستی بەوە کرد خاوەن داواکاری و دانپێدانان و هاوسۆزین و ئەوەش بەکردارەکی لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی بەدیدەکرا.. بەڵام بەداخەوە ئەو بەندانەو پەیماننامەی سیڤەریش سەبارەت بەکورد تەنها وەك مەرەکەبی سەرکاغەز مایەوەو خرایە پێناو بەرژەوەندییە ستراتیژییەکانی دەوڵەتە زلهێزەکانەوە. وەك هەمیشەش گەمەکردنی داگیرکاران بەدانیشتووانی ناوچەکەو چەواشەکردنی گەل و نەتەوەکانی بوو، بۆ ئەو مەبەستەش پەیماننامەکە دژ بەویست و ئارەزووەکانی کورد پیادەکراو هەر لەلانکەدا گشت هیواو ئاواتەکانی کورد لەباربران و نەهێڵران، بەڵام هێندەی نەبرد هیواو ئاواتەکان سەر لەنوێ لەدڵی گەل و دەستەبژێرەکانیدا بۆ ماوەیەك ژیایەوە، دووبارە داواکارییەکان سەریانهەڵدایەوە، ئەوەش لەئەنجامی گۆڕینی پەیماننامەی سیڤەرو پشتگوێ خستنی بەندەکانی بوو بەپەیماننامەیەکی تر، کەتیایدا ویست و ئارەزووە شەرعییەکانی کوردی تێدا پێشێلکرا، کەئەویش پەیماننامەی لۆزانی ساڵی (1923) بوو، بەپێی ئەم پەیماننامە نێودەوڵەتییە شوومەش وڵاتی کوردان بەشێوەیەك دابەشکرا کەتەواوی هیواکانی دواڕۆژی سەبارەت بەڕزگاری و سەربەخۆیی لەگۆڕنرا، ئەوەش پاش چەند سەرکەوتنێکی کەمالییەکان بەسەر یۆنانییەکاندا کە لەئەزمیر بەتەواوی ڕەنگیدایەوە.

بەم شێوەیە بەهۆی خراپەکاری و پشتگوێخستنەوە بەشێك لەکوردستان خرایە سەر کۆماری تورکیای کەمالی، کە لەسەر پاشماوەی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی بنیاتنراو، هەروەها بەشێکیشی خرایە سەر سوریاو بەشێکیش بۆ سەر عیراق، کەئەو دوو دەوڵەتەی دواییان بەپێی ڕێککەوتنەکانی نێوان فەرەنساو بەریتانیا (لەسایکس-بیکۆ)دا دروستکران، بەشێکیشی خرایە سەر ئێران و بەپێی ڕێککەوتننامەکەش ڕێ بەو دەوڵەتانە دراو دەستیان ئاوەڵاکردن تا پارێزگاریی لەو سنوورەی کەهەیە بکەن و بەو شێوەیە بمێننەوە، لەگەڵ گۆڕانکارییەکی کەمی ڕسوماتەکان، پاشانیش دژ بەکۆماری تازە دروستبووی مەهاباد هانی حکومەتی ئێرانیان دا بۆ ڕووخاندن و لەناوبردنی، پاش ئەوەی بەدەستنێژی ڕوسیای سۆڤێتییان دانا.

هەر پاش هاتنەکایەی پەیماننامەی لۆزان، کاتێك کورد هەستی بەو پیلانە وردو چنراوە کرد کەدژ بەهیواو ئاواتەکانی دواڕۆژ بوو، یەکیان گرت و خۆیان بۆ شۆڕش ئامادەکرد، ڕۆشنبیران و سەرەك عەشیرەتەکان و هۆزە چالاکەکان، بەخێرایی خۆیان ئامادەو پڕچەککرد.. یەکێك لەو بەرخۆدان و ڕاچەنینانەش، ڕاگەیاندنی شۆڕشی کوردستان بوو لە(15ی ئازاری 1925)،

کەیەکەم بروسکەی ئەو شۆڕشە لە (8)ی شوباتدا چەخماخەی داو پاش چەند مانگێك و چەند سەرکەوتنێکی خێرا، لەبەردەم درندەیی لەشکری نیزامیی کەمالییەکان‌و بەوەی رق وکینەی شاراوەیان بەسەریدا باراندو سەرجەم چەکە کوشندەکانیان لەدژ بەکارهێنان، بۆ ئەو مەبەستەش هێرشیان کردە سەر هەموو شتێك لەکوردستان و تەڕو وشکیان پێکەوە سووتاند و خانوو و ماڵی هاووڵاتییانیان رووخاندو گوندەکانیان گشت راگوێزاو کشتوکاڵ و دەغڵودانەکانیان و ئەو خێزانانەش کەچەند سەد کەسێك دەبوون لەژن و منداڵ و پیر گرتیێبەرداو سووتاندیانن، هەروەها ئەوانەشی پەنایان بردبووە بەر چیاو ئەشکەوتەکان، پاش ئەوەی دەروازەی ئەشکەوتەکانیان لەسەر هەڵچنین، گریان تێبەردان و سووتاندیانن.. سەوزاییان سووتاند، ورگی ژنانی دووگیان و کچان و منداڵانی بەربێشکەشیان هەڵدڕی.

ئاکامیش لەئەنجامی بێدەنگیکردن و ڕێپێدانیان لەلایەن کۆمەڵگای نێودەوڵەتی و وڵاتانی ئەورووپی و سۆڤێتی زەبەللاحیشەوە کوردستانیان بەدرێژی و پانیی بۆ خۆیان حەڵاڵکردو کەسیش متەقی نەکرد، بەڵکو بەپێچەوانەوە پشتیوانییان لەکەمالییەکان کردو ڕێیان دان تا لەشکرەکانیان بەڕێی هێڵی ئاسنیی (محیر) دا بگوێزنەوە، کەئەو ناوچەیە لەرێککەوتننامەکانی نێوان هێزە هاوپەیمانەکانی وەك فەرەنساو بەریتانیا لەلایەك و هێزەکانی میحوەر کەئەڵمانیاو تورکیا و ئەوانەشی لەگەڵیاندابوون بەبێلایەن دانرابوو، تا بەو ناوچەیەدا رەتبن و بەڕێی هێڵی حەڵەب- ماردین بەرەو دیاربەکرسووربخۆنەوەو پشت لەکوردە بێ چەك و بێوەی و سیڤڵەکان بگرن و ئابڵووقەیان بدەن، لەلایەکی تریشەوە لەگەڵ شای ئێرانیشدا رێککەوتبوون، ئەو کاتیش کۆمەڵەی گەلان کەتازە دروستبووبوو و بنەما نوێیەکانی (ویلسۆن)یش بۆ پاراستنی ئاشتیی نێودەوڵەتی و چارەسەری کێشەکان بەئاشتی و ئەو سازشانەش کەدەکران دەبوو لەڕێی رازیبوونی دوولایەنەی نێوان لایەنەکانەوە سەبارەت بەکێشەکان بکرایە، لەگەڵ ئەوەشدا کورد یەکرێزی و بووژانەوەو ..هتد و ئەمانە هەموویان دەبینی و دەیان بیست کەچی بەرامبەریان دەکرێت، لەولاشەوە بەریتانیا خەریکی ئینتیدابکردنی ئەو هەرێمانەبوو کە لەتورکیاو ئیمپراتۆرییەتە رووخاوەکەی دابڕیبوون و داگیریکردبوون.

بەم شێوەیە لەئەنجامی هەستکردن بەرپسوایی و کەوتنە ژێر چەقۆی بەرژەوەندخوازانەوە بەهیلاك چووبوون، هەر بۆیە رووداوو رەوش و شۆڕش و راپەڕینەکانی هاوشانیان و ئەو بەرخۆدانانەی ئەوسەردەمە کوردی گەیاندە ئەوەی بیرێك لەساڕێژکردنی برینەکانیان بکەنەوەو یەکگرتووییەك لەنێوانیاندا بێتەکایەوەو هەریەك لەوان هەستیان بەگوناهە گەورەو بچووکەکانیان کرد-ئەگەر کەمێك روونتر بدوێین-لەیەك کاتدا تاوانبارو لۆمەکراو هەر خۆی بوو، هەر بۆیە ئەو بەرپرسیارییەی خستە ئەستۆی و بەتەواوی خەباتی لەپێناو قۆناغێکی هەستیارو چارەنووسسازدا کرد، جا بۆیە دەیپرسی کەئایا ئەو یەکێك نییە لەم گەلە پاڵەوان و شەهیدە..؟ پاشان ورده ورده نەهامەتی و بێزارییەکانی گەلیش روو لەزیادبوون بوون، ئەمە لەکاتێکدا دەیبینی چی بەسەر خۆی و دەورووبەرەکەیدا دێت و چارەنووسی گەل و نیشتمانەکەی و هیواکانی مەترسییان لەسەرەو بەرەو لەناوچوون دەچن. ئەگەرچی وادەهاتە پێش چاو کەکەمێك رەوشەکەیان خستووەتە پشتگوێ، بەڵام لەڕاستیدا ئەو تێکشکان و نسکۆیانە، لەبەرامبەر مەسەلە چارەنووسسازەکاندا گەلی بەئاگا هێنایەوەو نەوەکانی لەدەوری کێشەیەکی چارەنووسساز کۆکردەوە، بۆشیان دەرکەوت کەپێویستە تەنها هەر خۆیان خەبات و تێکۆشان بکەن و ماف چارەنووسیان بەدەستبهێنن، ئەگینا نە کۆمەڵەی گەلان و نە هێزە هاوپەیمانەکان یان هەستە مرۆڤایەتییە نوستووەکان و ..هتدیش دادیان نادات و هیچیان لێ سەوزناکرێت.

هەر لەدەرئەنجامی ئەو رووداوو سیاسەتانەدابوو کە بەناچاری نەك خۆویستانە، کورد بەگشتی و کەسانی منەوەرو دەستەبژێر و سەرەك هۆزەکانیش بەتایبەتی بەئاگا هاتنەوەو لەو جەنگەڵە تازە دروستبووەدا لەدەرئەنجامی گۆڕانکارییە نوێیکاندا کەوتنە بەردەم تاقیکردنەوەیەکی راستەقینە، تا بتوانن بەرگری بکەن لەشتێك کەدەتوانرێت بەرگریی لێبکرێت و بپارێزرێت. لەدەرئەنجام رووداوەکانی پاشتریشدا، ئەوانەی مرۆڤیان تەنگەتاوکردو هیچ بوارێکی بۆ نەهێشتنەوە تا لەخەبات و تێکۆشان بوەستن، چونکە دەیانزانی وەستان و نووچدان مانای لەدەستدانی ئەو هەلەی لەپێشیان بوو، ئەویش بەهۆی بەرپابوونی جەنگی جیهانیی یەکەم و هەروەها شۆڕشی ئۆکتۆبەرو دابەشبوونی جیهان بەسەر دوو سەربازگەدا، پاشان شۆڕشە ناوخۆییە لەدوای یەکەکانیش کەرێی هەناسەدانی بۆ کردەوە، سەرباری ئەوانەش هاتنەکایەی بیرو بۆچوون و ئایدیۆلۆژیا نوێیە ئاڵوگۆڕکراوو سەرچاوەگرتووەکانی دەرەوە بوون، کەخەون و ویست و ئارەزووەکانی دەهێنایە دی و نەخشەیەکی نوێیان بۆ جیهانیش دادەڕشت و لەلایەن پێشەواو سەرۆکە نوێکان و لاوە خوێنگەرمەکانیشەوە پیادەدەکران، هەروەها سەرهەڵدانی چەند ناوێکی نوێیش کە بەنێگەتیڤ یان پۆزەتیڤ لەلایەن خەڵکییەوە باسدەکران، لەنموونەی لینین و مارکس و ستالین-غلیوم و هیتلەرو مۆسۆلینی، کەمال ئەتاتورك و عیسمەت و شەریفی مەکە-حسین فەیسەڵ، روسیای سۆڤێتی، ئینگلتەراو فەرەنساو ئەڵمانیا، سۆشیالیستی و شیوعیبوون-ئیمپریالی و برۆلیتاری و دیکتاتۆرییەتی پرۆلیتاری، هەڵوێست و واتەواتە نوێکان و گۆڕانکارییەکان، هەر لەگوێڕایەڵی و ئینتیمابوونەکان و تێڕوانینەکان بۆ فکرو بنەما سیاسی و کۆمەڵایەتییە باوەکان، هەروەها بانگەشە توندەکان بۆ چاکسازی و ریفۆرم و پێشکەوتن و سۆسیالیستی و وەلانانی کۆنخوازیی کە بەداب و نەریت و عورفە هۆزگەراییە دواکەوتووەکان بارگاویبوون، ئەوانەش بانگەشە بوون

بۆ ژیان و گەشبینی و فێرخوازی و رزگاربوونی ژنان و بانگەشەش بوون بۆ کارو تێکۆشان و وەبەرهێنانی زەوی و موڵکەکان و گۆڕینی هەموو شتێکی کۆنی وەك چەمکە هۆزگەرایی و ئایینییەکان.. لەڕاستیشدا، توێژێك لەسەرکردەو پێشەوای نوێ دروستبوون و هاتنەکایەوە کەجێگرەوەی بەگ و ئاغاو شێخ و مەلاکان بوون و رەگەزێکی نوێ و پیرۆز بوون..

* * *

سەبارەت بەژیانی "جگەرخوێن"یش ئەوەی لای هەمووان ئاشکرایە، لەسەرەتای سەدەی پێشوودا، بەتایبەت لەساڵی (1903ز) دا لەبەشی باکووری کوردستان لەدایکبووە، ئەو کاتەی گەنجێکی تازە پیگەیشتوو بوو، سەرجەم ئەو گەشەو پێشکەوتنانەی کە لەگەڵ جەنگی جیهانی و گشت ئەو کارەساتانەش لەئەنجامی جەنگی جیهانی دا سەریهەڵداو هاتەکایەوەو سەرجەمی پاشماوەو نەهامەتییەکانیش کە لەدەرئەنجامیدا کەوتنەوەو ئەوانەشی کەپاش جەنگی جیهانیی دووەم و گۆڕانکارییەکانی پاش جەنگیش هاتنە کایەوە، بەچاوی خۆی دیوە، پاش ئەوە ئەم ناوچەیە چەند گەشەکردنێکی بەردەوامی بەخۆوە دی کەبارگاوی بوو بەڕووداوو بیرو بۆچوونی نوێ و بەرخۆدان.. هەروەها ئەو کاریگەرییە زۆرو گەورانەو ئەو لایەنە جۆراوجۆرە تازە گەشەکردووانەو ئەو سەرنجە رەسەن و ناڕەسانەو سەرجەمی ئەو شتانەی کەهاوکات و پێ بەپێی ژیانە سیاسی-جوگرافیا-جیۆسیاسییەکان هاتنەکایەوە تیایدا ژیاوەو کاریگەریی لەسەری هەبوو.. هەر بەو پێیە هەستیکرد کە لەنێوەندی گێژاوەکانی ئەو سەردەمەدایە، کەئەو سات و سەردەمەش بانگەشەی دەستەبژێرە هۆزگەراکان لەپشکۆ گەرمتربوون و لەو سەردەمەدا لەباربوون، لەپاشکۆیاندا شۆڕشی چیاکان و بیروبۆچوونە سیاسییە باوەکانی سەرەتای سەدەی بیستی کۆمەڵگای ئیسلامیی سەردەمی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی، هەر لەدروستبوونی دەستوورو رێپێدانی پارت و حزبەکان بۆ کارکردن، لەئەنجامی شۆڕشی ئەفسەرە لاوەکانی سەر بە حزبی تورکە لاوەکان هاتنەبوون، بەسەر ژیانی سیاسی و چەقبەستن و پاشکەوتوویی و ..هتد کاریگەرییان هەبوو و رق و کینەشیان لەسوڵتان دەبووەوە، بەرامبەر بەو دەستوورەی لەساڵی (1908)دا بۆ وڵاتی دانا..

بەو شێوەیەش ئەو چاکسازییانە سەرجەم ناوچەو کۆمەڵگاکانی ناو ئیمپراتۆرییەتەکەی گرتەوە، لەوانەش کۆمەڵگای کوردی، بەتایبەتیش لەنموونەی (کۆمەڵەی تەرەقی و تەعالی)، پاشان رووداوەکان بەخێرایی و بەدوا یەکدا گەشەیان کرد، تا ئەو کاتەی (کۆمەڵەی خۆیبوون) لەساڵی (1927-1930) لەبەیروت دامەزرا، ئەو کۆمەڵەیەی رەگوریشەی سەرجەم ناوچەکانی کوردستانی گرتەوە، بەتایبەت کوردستانی کرمانج، کەمەبەست لەکوردستانی باکوورو باشووری رۆژئاوایە، بۆ رزگاربوونی هەزاران خەون و ئاواتانەی کەڵەکەبوو وگەڕاندنەوەی متمانە بۆ شۆڕشەکانی پێشوو و سەرجەم راپەڕین و نسکۆ یەك لەدوای یەکە رابردووەکان بەدرێژایی ساڵانیان و تۆڵەبۆ کردنەوەشیان، کەهەر لەڕۆژگارە دوورەکانەوە لای کورد ئەو تۆوە چەکەرەی کردبوو و پێش گۆڕانکارییە بەدوایەکەکانی سەردەمەکە کەوتبوو.. پێوانەو بارۆمەترەکانیش ئەو کێشمەکێش و ململانێ نێودەوڵەتییانەی ناوچەکە بوون، بەتایبەت لەنێوان وڵاتە داگیرکارەکاندا، کەئەوەش لەسەرەتای ئەم سەدەیەدا بوو، پاش ئەوەی وڵاتە داگیرکارەکان خواستی دەستبەسەرداگرتنی سەرجەم وڵاتە کۆلۆنیالکراوەکانیان لەڕۆژهەڵات و رۆژئاوا دا کەوتە سەر، تا بیکەنە بازاڕێك بۆخۆیان و زیادەی بەرهەمەکانیانی تیادا ساغبکەنەوەو بەدوای کەرەستە خاوەکانی پیشەسازییشدا بگەڕێن و وەك سەرچاوەیەك بۆ بەردەوامیی پیشەسازییەکانیان و ..هتد بەکاریبهێنن.

پاش ئەوەی داگیرکاران ویستەکانیان بۆ چووەسەر، سەرجەم کۆلۆنیالەکانیان بەمەبەستی سەرپەرشتی و ئاوەدانکردنەوەوە خستە ژێر ئینتیدابی خۆیانەوە، دوای ئەوەی لەوڵاتە ئینتیدابکراوەکانیشدا سەرکردەو کەسانێکی متمانەپێکراوی وایان نەدییەوە کەجێی باوەڕیان بێت، هاتن کوڕانی (شەریفی مەککە)یان هێناو کردیاننە ئەمیرو پاشا بەسەریانەوە، تا دانیشتووانی ئەو ناوچانە لەدەوری سەرکردە یان مەلیکێکی متمانەپێکراوی خۆیان کۆبکەنەوە، هەروەك لەعیراق و سوریاو ئوردون و رۆژهەڵاتی فەلەستین پێی هەستان، تیایدا مانەوەو ناوچەکەشیان کردە بازاڕێك بۆ بەرهەمەکانیان و زەوییەکی بەیاریش بۆ کەرەستە خاوەکان، بۆ ماوەیەکی دووریش وەك سەرپەرشتیاری ناوچەکە مانەوە، تا تورك و ئیمپراتۆرییەتە لەناوچووەکەیان نەگەڕێتەوە، کە تا ئەو کاتیش پیاوەکانیان و کلکەکانی کەسەر بەعوسمانییەکان بوون لەناوچەکەدا مابوون، ئەوانەی تا ئەو سەردەمەش بانگەشەیان دەکرد تا ئەو ناوچانەش بخەنە سەر تورکیاو کەماڵ و موڵکی عوسمانییەکانەو بەخوێنی باووباپیرانیان وەدەستیان هێناوەو ..هتد.

لەلایەکی تریشەوە رێیان بەدانیشتووانی ناوچەکە دا تا پیادەی جۆرە ژیانێکی سیاسیی کراوەو کاری دەستووری و چاکسازی و پەرلەمانی بکەن، بەهەندێك هیواو ئاواتی بووژاوەوە، تا خۆیان حوکمی خۆیان بکەن و لەماوەیەکی دیاریکراوداو بەپێی رێککەتننامەو پەیماننامەکان وڵاتەکەیان پێ بدەنەوە، هەروەها ماوە یان ختووکەی هەستی سەربەخۆبوون و خودموختارییان لای کەمینەو تایەفەکان دەورووژاند.. ئەوەی زانراویشە فەرەنسا بەپێی پەیماننامەی (سایکس بیکۆ) لەگەڵ ئینگلیز ناوچەکانی شام و سوریای گەورەی ئینتیدابکردبوو، دەیانویست بەدەستی خۆیان خورییەکە برێسن، بەڵام پاش ئەوەی رێسەکەیان لێبووەوە بەخوری، پەنایان بردە بەر دروستکردنی هەستی تایەفەگەری و وایان پێ خۆشبوو ناوچەکە بەشبەش بکەن و چەند دەوڵەتێکی بێ کێشەو

قاڵەیان لێ دروستبکەن کە لەگەڵ ویستەکانیاندا بگونجێت.. پاش ئەوەی ڕێیان بەمەسیحییەکانی لوبنان و جوولەکەکانی فەلەستین و سەرجەم ناوچە موسوڵمان نشینەکانی تریش دا، بەڵام ڕێگرییەکی تر هاتە کایەوە، هەر بۆیە حەزیانکرد سوریا بۆ چەند دەوڵەتۆچکەیەکی وەك (جەبەل عەلەوی)و (جەبەل دروز) بەشیعەکان بدەن و ئەوەشی مایەوە بۆ سوننەکان و دەنووکی مراوییەکەش یان ناوچەی جەزیرە بۆ کورد، بەڵام ناچاربوون سەرجەم موسڵمانەکان پێکەوە لەدەوڵەتێکدا کۆبکەنەوە، هەر واشیان کرد، سوریاو لوبنان و فەلەستینیش یان دابەشکرد، چونکە لەکێشەو ململانێ و بانگەشە ئایینییەکانی داهاتووی ناوچەکە دەترسان، یاخود ترساندبوویانن، کەزەقترینیان گێڕانەوەو شانازیکردن بوو بەمێژووی کۆنیانەوە بەپلەی یەکەم و زیاتر لەکێشەو ململانێ نەتەوەییەکانی تر..

لەبەرئەوە لەبەرامبەر نەتەوەو تایەفەکانی تردا جۆرێك لەهەست و سۆزیان دەنواند و هەندێك هیواو ئاوات و بەخششیان پێدەدان بەهەندێك سەربەستییەوە-بەپێی پێویست، هەروەك ئەوەی بەرامبەر بەکورد، یان بەرامبەر سەرجەم ناوچەکە نواندیان کەئەویش لەژێر فشاری جەنگی جیهانیی دووەم و ئەو تاڵاوەدا بوو کەبەدەست ئەڵمانیاوە چەشتیان.. ئەوی ڕاستی بێت ئەم باسەمان درێژە زۆر دەکێشێت، لێرەشدا ئێمە نامانەوێت درێژە بەباسی سیاسەتەکانی ئەوروپا و کێشمەکێشە تێکشکێنەرەکانیان بدەین، بەقەد ئەوەی دەمانەوێت بیرو بۆچوونێك لەسەر ڕەوشی ناوچەکەو ئەوەی بەسەر کوردا هاتووە لەناوچەکەدا بیخەینەڕوو، کاتێك داگیرکاران سۆزێکیان بەکورد دا، یاخود تێگەیشتنی کەمیان سەبارەت بەداهاتوویان و نیگەرانییان لەبەرامبەر تێکەڵاوبوونی تایبەتمەندی و ڕەگەزایەتییان بەبێنەو بەرەی ڕووداوەکان، بەتایبەت لەساڵی (1943)دا کاتێك فەرەنسییەکان و ئینگلیزەکان لەچەند ناوچەیەکدا لەبەرامبەر کورددا نەرمییەکیان نوواند، بێگومان ئەوەش لەبەر خاتری چاوی ڕەشی کورد نەبوو، بەڵکو بۆ فشار خستنە سەر وڵاتانی ناوچەکە بوو، لەنموونەی تورکیای کەمالی و عیراقی پادشایی و سوریای دەستووری..

بۆ نموونە لەسوریا پشتیوانیی کوردیان کرد بۆ دامەزراندنی کۆمەڵەی ڕۆشنبیری و دەرکردنی گۆڤار، وەك گۆڤاری (هەوار) لەدیمەشق و (ستێر)و (روناهی)یش لەبەیروت، هەروەها ڕێیان بەبڵاوکردنەوەی کتێب و سازدانی ئاهەنگی موزیکی و فێستیڤاڵدا هەروەها بەپەخشی رادیۆیی لەبەیروت-بەدەنگی میر کامەران بەدرخان و پاشان نورەدین زازاو ئەوانی تر-کەئەو باسە لێرەدا لەلایەن منەوە بۆ دەرخستنیانە وەك دوو نیشانەی دەرکەوتوو- (د.نورەدین زازا لەکتێبەکەیدا (ژیانی کوردەواریم)، دەڵێت: (بەشێوەیەکی گشتی پەخشەکە بەئاشکرا باسکردنی کێشەی کورد بوو، هەروەها خوێندنەوەی چامەو هۆنراوە نەتەوایەتی و شۆڕشگێڕییەکان و بانگەشکردن بوو بۆ کورد تا لەخەو بێدارببنەوەو لەپێناو مافەکانیاندا تێبکۆشن).. هەروەها دەڵێت: (ئەوەش تا ڕۆژێك لەڕۆژەکانی ساڵی (1946)ی خایاند کاتێك دەسەڵاتدارانی لوبنانی دەستیان بەسەردا گرت و دایانخست).

هەروەها د.نورەدین زازا لەکتێبی ناوبراودا دەڵێت: (فەرەنسییەکان دەستیان واڵادەکردین تا بەچالاکییە سیاسی و هونەرییەکان هەستین، هەروەك ڕێشیان دەداین تا لەنێوان گوندە کوردییەکاندا بگەڕێین و چالاکییە نەتەوایەتییەکانمان بەناو جووتیارەکاندا بڵاوبکەینەوە).. هەروەها دەڵێت: (هەوڵماندەدا وشیاریان بکەینەوەو سەرنجیان بۆ ئەو چەوساندنەوە نەتەوایەتییەی لەسەریان بوو ڕابکێشین، کە لەزەوی و پیت و بەرەکەت و بەروبوومەکانیان بێبەریی دەکردن، هەروەها بۆ شۆڕشکردنیش دژ بەکۆیلەکردن هانمان دەدان).

هەروەك کەمێك زیاتر بەچالاکیی زیاتر دراوە.. وەك پێکهێنانی کۆمەڵەی (خۆیبوون)، وەك لەسەرەوە باسمان کرد، دیدەوانانی کوردو لاوانی کورد-ئەو دیدەوانانەی لەشاری عامواو بەسەرکردایەتیی جگەر خوێن دامەزراو دروستبوو، کە لەوبارەیەوە د. نورەدین زازا دەڵێت: (لەدیمەشقدا گەڕەکە کوردییەکان شوێنێکی شیاوبوو بۆ ئەو چالاکییانە، کەتیایدا پەیوەندییە ڕۆشنبیری و وەرزشییەکان هاتەکایەوە، بەشێوەیەك کەئەدیبان و زمانەوانە کوردەکان بەسەربەستی خەڵکیان فێری زمانی کوردی دەکرد).. هەروەها د.زازا دەڵێت: (هەروەها لەساڵی (1939)دا دروستبوونی تیمێکی تۆپی پێمان بینی کەناوی (تیمی کوردستان) بوو، کە بەشێوەیەکی ڕێکوپێك بەشداریی لەو یارییانەدا دەکرد کەیانە وەرزشییەکانی دیمەشق ڕێکی دەخستن، کە تیمی ناوبراو لەساڵی (1940)دا پاڵەوانێتیەکەی بەدەستهێنا، کەتیپێك بوو زۆر بەتوندی حەماسەتی دەورووژاند، بەشێوەیەك جەماوەر لەقامیشلییەوە بۆ پشتگیری و پشتیوانیکردنی یاریزانان دەهاتن، ئەوەش ڕووداوێکی سەیرو سەمەرە بوو، کاتێك دەنگی هەزاران تەماشاکار لەناوجەرگەی دیمەشقدا دەبیستراو بەهەموو توانایانەوە هاواریان دەکرد: (دەی کوردستان.. هێرش بەرە کوردستان.. بژی کوردستان) لەو بارەیەشەوە ئەو ڕۆژنامانەی یارییەکانی بڵاوە گرنگ بوو بەناونیشانێکی گەورە دەیاننووسی: (کوردستانی سەرکەوتوو) و ئەوەش دڕندایەتیی سەفارەتی تورکیای لەدیمەشقدا ورووژاندو گشت تواناو قورسایی خۆی سەبارەت بەدانانی سنوورێك بۆ خۆپێشاندانەکانی دژ بەتورکیا خستەگەڕ، لەلایەنی دەسەڵاتدارانی فەرەنساو سوریاوە..؟!!)، زازا دەڵێت: (سوریاو فەرەنساش بەخێرایی و بۆ ڕازیکردنی دەسەڵاتدارانی ئەنقەرە، سەرجەم کۆمەڵەو دامەزراوە ڕۆشنبیرییەکانیان ناچارکردین تا لەچالاکی بوەستن..)..ل68.

بەپیادەکردنی کەمێك لەژیانی دەستووری و هەڵبژاردن لەگەڵ

كەمێك سەربەستی و دیموكراسی بەمەبەستی پێكهێنانی پارت و كۆمەڵەو مونتەداكان، رێ بەپیادەكردنی ژیانی سیاسی درا، لەو بارەیەشەوە مشعەل تەموی نووسەر بەزمانی زازاوە ئەم وتارە لەشێوەی بروسكەیەكدا ئاراستەی سەرۆك جەمال عەبدولناسردەكات، پوختەی وتەكانیش سەبارەت بەرەوشی كوردە بەگشتی و هۆی دامەزراندنی حزبێكی تایبەت بەكوردیش بەتایبەتی باس دەكات، كەئەو كات (زازا) لەبەندیخانەی مزە دا بەندی بوو:

-(بۆیە لەسوریا پارتی دیموكراتیی كوردیمان دامەزراند، بۆ ئەوەبوو كە هەر لەساڵی (1949)وە دەسەڵاتە عەسكەرتارییە یەك لەدوا یەكەكان هیچ شتێكیان نەكرد، جگە لەپێشێلكردنی رەوشی دیموكراسی لەسوریا، هەروەها ئەو مافانەشی كەكورد پلە بەپلە وەدەستی هێنابوون لێی سەندنەوە، لەساڵی (1955)یشەوە حكومەتی سوریا كەبەعسییە شۆڤێنییەكان دەستیان بەسەردا گرتووە، لەسەرجەمی چێشتخانەو چایخانەكانی ناوچە كوردییەكاندا پەنایان بردە بەر لەناوبردن و شكاندنی سەرجەم ئەو نەوارانەی كەگۆرانی و مۆزیكی كوردییان لەسەر تۆماركرابوون، ئەوانەشیان بەندكردن كەكتێبی كوردییان پێگیرا، ئێستاش یەكگرتنی سوریاو میسر چاوەڕوانی ئەوەی ناكرێت تەگەرە بخاتە بەردەم ئەم سیاسەتەی هۆكاری پاشكەوتنی رۆشنبیرییە، بەپێچەوانەشەوە ئەو سیاسەتە زیاتر بەرەو رەگەزپەرستی و فاشییەت چووەو ستەمكار تر بووە، ئەمرۆش لەسوپای سوریادا ئەفسەری كورد نابینرێت و بوونی نییە، هەروەها فەرمانبەرێكی پایەبەرزیش لەئیدارەی دەوڵەتدا نییە، جگە لەوەش نەمامۆستایەك، نە پۆلیسێك لەناوچە كوردییەكاندا وەدی ناكرێت، تەنانەت ناشتوانین بەزمانەكەمان سەربەستانە بدوێین، پێشدەچێت داهاتوومان تاریك بێت، ئەوەش بەیەكگرتن ناچارمان دەكات، هەر ئەوەش بوو پاڵپێوەناین پارتی دیموكراتی كوردی سوریا دابمەزرێنین، لەبەرئەوە داوا دەكەین لەكۆماری عەرەبی یەكگرتوودا رێزمان بگیرێت، لەبەرئەوەی ئێمە كوردین..! هەر وەك داوادەكەین رێمان بدەن پەرە بەئاستی كولتووری و رۆشنبیریمان بدەین و وەك هاووڵاتییانی تری ئەم كۆمارە مافەكانمان پیادە بكەین).

بەراستی.. واقیع ئەو وتانەی دكتۆر نورەدین-ی سەلماند، ئەویش لەڕووی بێبەشبوونی رۆڵەكانی گەلی كوردی سوریا لەماف هاووڵاتیبوون بەگشتی و بەتایبەتیش مافە رۆشنبیری و مرۆڤایەتییەكان لەلایەك، هەروەها توندبوون و درندانەتربوونی هێرشە شۆڤێنییەكان لەهەوڵی توانەوەو لەناوبردنی بوونی ئەو میللەتەی كە بەدرێژایی مێژوو لەگەڵ عەرەبدا ژیاوە، ئەویش لەڕێی بەكارهێنانی گشت هۆكارەكان و خستنەگەڕی گشت هەوڵە رەگەزپەرستییەكان لەلایەكی ترەوە، كەلێرەدا ئاماژە بەو پیلانی لەناوبردنە دەدەم كە لەلایەن ئەفسەری ئاسایشی سیاسییەوە لەپارێزگای جیزە (كەئێستا حەسەكەیە) لەساڵی (1962) دا نەخشەی بۆ دارێژرا، كەزۆر راشكاوانە رایدەگەیەنێت كە لەو بارەیەوە پێویستە سوود لەئەزموونی كیبوتساتی ئیسرائیلی وەربگیرێت..!!

روانگەیەكی رەخنەگرانە لەدیاردەی پاشكەوتنی سیاسی لەسوریا-مشعەل تەمو..

لەو كاتەشدا/لەكاتی جەنگی جیهانیی دووەمدا/ لەكوردستانی باشووردا بەرەنگارییەك هەبوو، كەبووە هۆی دروستبوون و چالاكبوونی حزبی هیوا لەسولەیمانی، بەوەی لەنێو هۆزەكانی ئەو ناوچەیەدا بەخێرایی بڵاوبووەوە، كەكادیرو ئەندامەكانی بریتیبوون لەجووتیاران و خوێندكاران و سەركردە دەرەبەگەكان و ئەفسەران و سەربازان، كە لەلەشكری عیراقیدا خزمەتی سەربازییان بەجێدەهێنا.. كەئەوەش رێی بۆ شۆڕشی بارزانییەكان خۆشكرد بەسەركردایەتیی مەلا مستەفای بارزان، كە لەگەڵ هەندێك لەپیاوەكانیدا بەیارمەتیی دەستەی دامەزرێنەرانی حزبی هیوا، توانیی بەرەو سولەیمانی هەڵبێت و بگاتەوە بارزان و لەماوەیەكی كەمیشدا چەند سەد كەسێكی لەدەور كۆبووەوەو شۆڕشی راگەیاند..

بەو شێوەیە، لەكاتی جەنگی جیهانیی دووەمدا رێ بەكورد درا تا هەندێك چالاكی ئەنجامبدات، ئەویش لەپاشكۆی داواكارییەكانی توركیادابوو بەخستنی ولایەتی موسڵ بۆ سەر توركیا، هەروەها یارمەتیی توركیا بۆ ئەڵمانیا، بەپێدانی هەندێك كەرەستەی پیشەسازیی سەربازیی.. هەروەها خستنەوەگەڕی هێڵی ئاسنیی لەلیوای ئەسكەندەروونە، كەلێرەدا نورەدین زازا لەكتێبەكەیدا بەناوی (ژیانی كوردەواریم) باسی كردووە كەدەڵێت: (كاتێك ئینگلیز دڵنیابوو لەوەی توركیا ئاگادارییەكانی پشتگوێ دەخات و هیچ بوونێكی بۆ دانانێت، یەكسەر پێشوازیی لەشۆڕشی چەكداریی كوردەكان كردو بۆ دامركاندنەوەشی، هێزە تایبەتەكانی خۆی بەكارنەهێنا..) و.. و.. هتد.

هەر لەو بارەیەوە نورەدین زازا لەو كتێبەیدا باس لەئاگربەستی فەرەنسییەكان دەكات سەبارەت بەكورد لەوڵاتی شام و دەڵێت: (لەو كاتەدا فەرەنسییەكان كە بەدەست كێشە گەورەكانەوە لەئەورووپادا هیلاك بووبوون، هیچ چاودێرییەكی جددی نەسەپاندە سەر دامەزراوەی رادیۆی بەیروت، هەر بۆیە رێیان پێدراین بەسەربەستییەكی تەواوەوە راكانمان دەربڕین)..

لێرەدا دێینەوە سەر باسەكەمان، ئەو قوتابخانەیەی جگەر خوێنی لێ دەرچوو، كەئەویش گەشت وگەڕانی بوو بەدرێژی و پانیی كوردستاندا بەشاخ و دۆڵ و دەشتەكانیدا، هەروەك زانراویشە كەئەو دەرچووی حوجرەو تەكیەكان و دەستنێژی مەلاكان بوو، كە لەو كاتەداو لەسەردەستی پیاوە ئایینییەكان و زاناو مەلاو شێخەكاندا، تەنها زانستە ئایینییەكان و شەریعەو (سەرف و نەحو)ی قورئانی دەوترایەوە، كەهەر ئەوانیش بەتوێژی رۆشنبیری

هۆشیار دادەنران لەو کاتەدا، واتا ناوبراو دەرچووی زانکۆ یان پەیمانگاکانی ئەوروپا-فەرەنسا نەبوو، بەوێنەی رفاعە تەهتاوی، یان دەرچووی هیچ کام لەو خوێندنگایانەش نەبوو کە لەلایەن مژدەدەرە مەسیحییەکانەوە لەولاتی شام و جەبەل لوبنان کرابوونەوە، لەنموونەی ئەوانەش (بیت البستانی-ماڵی بوستانی) و یازجی و ..هتد.

کەئەوەش رۆشنبیرییەك بوو کەهاوتای هۆشیاریی بەکۆمەڵی گشت ناوچەکە بوو، هەر لەبانگەشەکانی زیندووکردنەوەو نوێکردنەوەو بلاوکردنەوەی بیری نەتەوایەتی و زمانەوانی و یەکێتیی چارەنووس و مێژوو.. کەئەوەش وەلامێکی سروشتیی بوو بۆ ئاڵوگۆڕکردن و بلاوبوونەوەی ئەو بیروبۆچوونانە، بەشێوەیەك ئەگەر بێت و کەسێك بەناوی ئیسلامەوە بانگەشەی بکردایە، سەبارەت بەپەیوەندییە کۆمەلایەتی و سیاسییە پتەو و بەهێزە نوێکان رەوشەکە چۆن دەکەوتەوە، ئایا پێشترو لەیەکەم جاردا بانگەشەکان ئیسلامی نەبوون..؟، کەدەبووایە رووپۆشکردنی شتەکان بەشێوەیەك بوونایە تا بەردەوامیی بۆ دەستەبەربکرایە، ئەوەش ئەوروپا بوو، کەئینگلیزەکان و فەرەنسییەکان نوێنەرایەتییان دەکردن و کاریان لێك هەڵوەشاندنی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی و یەکگرتوویە بەهێزەکەی بوو کەئیسلام بوو، کە یەکێك بوون لەوانەی بانگەشەی بیری نەتەوایەتی و یەکە جوگرافییەکانیان دەکرد، بەم شێوەیەش بینرا کەدەتوانن رۆڵێکی سەرەکیی لەناوچەکەدا بگێڕن و ئاوازێکی نوێی تازە دابهێنن، کەئەوەش ئاوازێکی نوێ بوو کە بۆ ئێسك و پروسکی جەستە نوێکاندا دەژەنراو کەسانێکی نوێیان پێ مەستدەبوون، ئەویش ئارامی و ئاسایش و حەوانەوەی گەل بوو..

هەر بۆیە وای لێهات "جگەرخوێن"یش بانگەشەی بۆ ئەوە دەکرد کەکاری تێکردبوو.. بەشیعرو ئەدەبەکەی هانی خەڵکیی دەدا بۆ شۆڕش و رزگاربوون، هەروەها بانگەشەی بۆ یەکبوون و یەکدەنگیی و تەبایی دەکرد تا هێز وەدەستبهێنن، هەروەها بانگەشەی بۆ دابەشبووانی کوردستان دەکرد بۆ برایەتی و یەکسانی و ژیانی هاوبەش.. هەروەها بۆ رزگاربوونی ژنان و یەکسانی لەنێوان هەمووان‌دا.. بۆ ئەوەی کەتۆوی خۆشەویستی و تەبایی و یەکێتی و برایەتی لەزەویی کوردستاندا دەچێنێت، تا گوڵ و لق و پۆپ بکات و بێتەبەر ئەویش پاش سەوزبوونی ئاشتی و پێکەوە ژیان لەرۆژانی داهاتوودا..

لەو کاتەدا، کەسەردەمی هوشیاربوونەوەو هەستانەوەی سەرجەم گەل و گەشەی هۆشیاریی نەتەوایەتی بوو، لەجیاتی گوێڕایەڵیکردن و ملکەچبوون بۆ عەشیرەت و هۆز، لەبەر ئەوە کەسانی منەوەر وایان دەبینی خستنە سەرپێی نەتەوەکەیان ئەرکی سەرشانیانە، تا لەدەست هەردووك داگیرکەری ئینگلیزی و فەرەنسی رزگاربن و پاش سەربەخۆبوونیان لەدەست حوکمی عوسمانی کەلەسەر دەستی ئەواندا هاتبووە دی، هەروەها ئەو خەون و خولیا جوان و بەتاموچێژەی وەك پەتایەك بۆ بەدەستهێنانەوەی سەربەستی و سەربەخۆبوونی تەواوەتی لەناوچەکەدا بلاو بووبووەوە، ئەوەبوو کەسەرەتا بەدژایەتیکردنی نەزانی و نەخوێندەواری و زیندووکردنەوەی زمان دەستیپێکرد، هەروەها بەرگریکردن بوو لەدژ سیاسەتی تواندنەوەو نەمان و نقوم نەبوون لەئایین و هەڵنەخەڵەتاندن بوو بەو ناوەوە.. ئەوەش چەند وڵاتێکە کە لەژێر ناوی ئیسلام و بانگەشەی ئیسلامدا، هەرچییەکی لەتوانادایە دەیکات تا بەتەواوی کورد لەناوببات و لێکی دابڕێت و ..هتد، دەبا رووداوە جیهانییەکان و ئەوەشی رووەدات بخرێتە بەردەم کوردی نوقمبوو لەنەزانیدا هەر لەگەمە نێودەوڵەتی و ئیستعماری و دابەشکردنەکانی میراتییەکان ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی لەنێوان هێزە دوورو نزیکەکانی ناوچەکەداو بەئاگابن لێی..

بەڵێ.. ئەوی لێرەدا بڕیاربوو-کەشوهەوای گشتیی ناوچەکە و جیهان لەبارببوو بۆ تاوتووێکردنی ئەم بیروبۆچوونانە، ئەویش بەکاریگەریی ئەو گۆڕانکارییە ریشەییە نوێیانەی لە ناوچەکەدا هاتنەکایەوە، بەتایبەت جەنگی جیهانی یەکەم و شۆڕشی ئۆکتۆبەری ساڵی (1917ز)ی سۆڤیێتی بەسەرکردایەتیی لینین، هەروەها رەزامەندیی ناوچەکە بەوەرگرتنی فکرو ئایدیۆلۆژیای نوێ و ئەو گۆڕانکارییە ریشەییانەی کەگشت چەمك و روانگەکانی گۆڕی، بەوەی دەشێت گۆڕانکاریی بکرێت ئەگەر سەرجەم گەل بکەونە خۆیان و داوای مافەکانیان بکەن، ئەوەش روونە کەسەردەمی زوڵم و زۆرو داگیرکاری و بەکارهێنانی هێزو توندوتیژیی بەسەرچوو.. ئەم سەردەمە سەردەمی ماف چارەی خۆنووسین و مافەکانی مرۆڤیش لەیەکسانییاندایە، کەرێکخراوە سۆسیالیستییەکانی هاوزەمانی پرەنسیپ و بنەما رۆژئاواییەکان بانگەشەیان بۆ دەکردو شانازییان پێوەدەکردو تەواوکاری بوون، ئەوەش لەدەرئەنجامی ئەو جەنگە سەختانەو کەوتنی ئیمپراتۆرییەتەکاندا بوو، بەتایبەت عوسمانییەکان، کە بەدرێژایی چوار سەدە دەستیان بەسەر کوردستاندا گرتبوو، سەردەمەکانی ناپاکی و دواکەوتن و رق و کینە، ئەوانەش دەرکەوتەکانی سەدەی زێڕینی تەکنۆلۆژیاو بیرە پێشکەوتنخوازو سەربەست و درەوشاوەکان بوون.

لەدەرئەنجامی ئەو جەنگی جیهانیی یەکەمداو ئەو شۆڕشەدا-شۆڕشی ئۆکتۆبەر-و پرەنسیپەکانی ولسۆن-کاتێك ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی کەوت، ئەو ئیمپراتۆریەتەی مۆتەکەی سەر سنگی کوردستان بوو داگیرکردبوو، دەوڵەتەکانی تورکیاو ئێران و بەم تازەکییەش وڵاتانی دەستکردی وەك عیراق و سوریا و سەرجەم وڵاتە عەرەبییەکان دروستبوون، داگیرکارە بیانییەکانیش کەخۆیان لەبەریتانیاو فەرەنسادا دەنواند، یارمەتییان پێشکەشدەکردو پشتگیریی رزگارییان دەکردو باوەڕیشیان بەدیموکراتییەت بوو

دانیشیان بەماڤی چارەی خۆنووسینیشدا دەناو پەیمانی سەربەستی و رزگاریشیان بەگەلان دەدا، بەڵام کاتێك مەسەلەکە هاتە سەر کورد.. لەلایەن وڵاتانی تازە دروستبوو و دەستنێژی داگیرکارانی بیانییەوە، رووبەرووی بەرپەرچدانەوەیەکی سەخت بوون، تەنانەت لەبەرامبەر ئاساییترین مافیاندا جەنگیان لەدژ بەرپاکراو مەترسیی نەمان و نەهێشتن و توانەوەیان خرایە سەرو رێگیرییان لێکرا، تا ئەو کاتەی سەردەمی داگیرکار بەسەرچوو و دابەشکارو کورد مانەوە.. کە تا ئێستاش کورد بەدەست نەهامەتی و لەناوبردن و ئازارو ئەشکەنجەوە دەناڵێنێت و سیاسەتی رەگەزپەرستیی لەدژ پیادە دەکرێت، ئەوەش شتێکی ئاشکرایەو تا ئێستاش بەو شێوەیە کاری لەدژ دەکرێت.

لەکۆتایی جەنگ و راگەیاندنی مافەکانی مرۆڤ لەلایەن سەرۆکی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە: تۆماس وودرۆ ویلسۆن لەبەردەم کۆنگرێسی ئەمریکادا لە (8ی تشرینی یەکەمی ساڵی 1918ز) دا بوو، کە تائێستاش بەراگەیاندنی چواردە (بنەماکانی ویسلۆن) بەناوبانگە بۆ ئاوبژیوانیی نێودەوڵەتی، بانگەشەی دانانی بناغەی کۆمەڵگای جیهانیی نوێ، کە پابەندە بەپرەنسیپی چارەی خۆنووسین، کە لەپێشتر داو لەدروستبوونی (کۆمەڵەی گەلان)دا سەرکەوتنی وەدەستهێنا.. کەشوهەوایەکی پڕ لەئومێدو هیوای لەنێو گەلاندا دروستکرد، لەهەمان کاتیشدا دڵەڕاوکێیەکیشی لەسەرلەنوێ دارشتنەوەی نەخشەی جیهاندا هێنایە کایەوە، کە هەرواش دەرچوو ئەوەبوو لەکۆتاییدا، لەئاسیاو ئەوروپاو ئەفریقیاو سەرجەم ناوچەکانی جیهاندا چەندین کۆمەڵگاو وڵات سەربەخۆییان بەدەستهێنا، کە بەتایبەتی ئەوەش لەسایەی ئەو پرەنسیپ و بنەمایانەدابوو کەبەئاشکرا کێیان بویستایە کەئەو پرەنیسپ و بنەمایانە شمولی بکردنایەو..هتد.

ئەمەش باسێکی ئاسانی ناوەرۆکی چواردە بنەماکەی ویلسۆن-ە: کەئەویش بەرنامەو بنەمای هاتنەکایەی ئاشتیی نێودەوڵەتییە:

-دەکرێت پوختەی پێنج بنەمای یەکەمی ئەو بەندانەی ویلسۆن بەم شێوەیە بخەینەڕوو: چارەسەرکردنی ململانێ داگیرکارییەکان، بەهاوسۆزی و لەبەرچاوگرتنی ویستی دانیشتووان و بەرژەوەندییەکانیان، لەناوچە داگیرکراوەکاندا.

-هەروەها ئەو هەشت بنەمایەشی کەدەمێنێتەوە، کەسەبارەت بەجەنگی جیهانی و دەرئەنجامەکانی و سنووری وڵاتانە، کەگرنگترینیان ئەوەیانە کەدەڵێت: لەقاڵبدانی حوکمی تورکەکان بەسەر هاوڕەگەزەکانیاندا..

بەندی چواردەهەم و کۆتاییش بانگەشەی دروستبوونی کۆمەڵەی گەلانی کرد، لەپێناو جێبەجێکردن و بەدواداچوون و پیادەکردنی یەك بەیەکی سەرجەم ئەو بنەمایانە، کە جگەر لەچامەیەکدا بەناوی (هەی فەلەك) لەگەڵ ویلسۆن دەدوێت و دەڵێت:

(گشت بەندەکانی بنەماکانت دڕاند، پەیمانەکانت وەك کۆمەڵەی گەلانە)..

راگەیاندنی ئەو بەندانە کاریگەرییەکی قورسی کردە سەر سەرجەم گەلان، لەبەرئەوەی لەهەموو شوێن هیواو ئاواتی لەدڵیاندا چەکەرە پێدەکرد و دەیورووژاندن.. هەر کەسیش رەوایەتیی ئەو بەندانەی بەپێی بەرژەوەندییەکانی لێکدەدایەوە، بەم شێوەیەش کورد هەستی بەچۆنێتیی گەمەکە کردو شێوازەکەشیان بۆ ئاشکرابوو، بەتایبەت کەسانی پێشڕەوو دەستەبژێرو رۆشنبیرە-هۆزگەراکان تا بەرۆلێکی گەورە هەستن و هەنگاو بەرەو بزوتنەوەی رزگاریخوازی بنێن و بانگەشەی سەرفرازی و شۆڕشیان بەسەر کۆنخوازیی بەسەرچوودا دەکرد، بەوەش رابردوو و دواکەوتووەکانیان وەلا دەناو، بەوەی کوردیش خاوەن شارستانییەتەو کەسایەتی و رەگەزێکی تایبەت و جیایان هەیە، هەروەها خاوەن پەیامێکی مرۆڤایەتیی رۆشنیشە، هەروەها مافێکی رەواشی هەیەو ماڤی خۆشیەتی خۆبەخۆ ماڤی چارەنووسی خۆی بنووسێتەوە.

بەڵێ.. پاش ئەوەی میراتیی عوسمانییەکان، ئەوەی پیاوە نەخۆشەکە جێی هێشتبوو لەنێوان وڵاتە داگیرکارەکاندا دابەشکرا، میراتیی پیاوە نەخۆشەکەش بریتیبوو لە تورکیای لاو-کەمالییەکان و ..هتد، کەچییان لەتوانادابوو کێشمەکێشیان لەسەرکرد تا گەورەترین رووبەری ئەو میراتییە بۆخۆیان بپچڕن، هەروەها ئێران و ئەوەی کەبۆخۆی پچڕیوەتی، هەروەها پەیماننامەکانی سایکس بیکۆ، کە لەدەرئەنجامدا دەوڵەتەکانی عیراق و سوریاو ئەوانی تری لێ کەوتەوەو دروستبوون.. بەڵێ میراتیی باوکە مردووەکە دابەشکرا، ئەوەی بەشیشی دەکرد ئینگلیزەکان و فەرەنسییەکان و ئەوانە بوون کەلەدەوریان کۆبوو بوونەوە.. کێ داواکاری هەبوو داواکارییەکانی خۆی پارێزگاریی کرا، کێیش بەزۆر هەر چییەکی پچڕیبوو بۆی مایەوەو..هتد، ئەوانی تریش بەڵێنیانی سەربەخۆییان بۆ دوایی پێدرا.

بەگشتی کەشوهەوای ئەو کاتی جیهان بۆ قبووڵکردنی سەرجەم ئەو بیرانەو توانای پیادەکردنیان بەسەر خودی کورددا لەباربوو، کەئەگەر نییەتێکی پاك و سووربوونێکی پێویست بۆ رزگاری و سەربەخۆیی وەك سەرجەم گەلانی ناوچەکە هەبووایە، تا راپەڕن و شۆڕش بکەن و ..هتد، هەر بۆیە پاش زۆرترین شۆڕش و راپەڕین و ئەزموونی تراژیدیی پێشوو، کەتا ئێستاش کورد لەهەوڵ و تێکۆشانەکانیان نەوەستاون و بەردەوام داوای مافەکانیان کردووە..

* * *

پاش لکاندنی کوردو کوردستان بەو دەوڵەتە تازە دروستکراوانە، بەپێی پەیماننامەی سایکس بیکۆ، گەلی کوردیش وەك گەلانی تری ناوچەکە لەپێناو داواکردنی مافەکانیدا وەبەرخۆی هاتەوە، ئەویش لەدەرئەنجامی هەستکردنیدا بوو بەگێلکردنی و خۆگێلکردنیش لەمافەکانی و رەوایەتیی مافەکانی، لووتکەی ئەو شۆڕش و

بزوتنەوانەش، شۆڕشی شێخ سەعیدو دەرئەنجامەکانی بوو، ئائەمیش بچێتە پاڵ ئەو شۆڕشانەی پێش خۆی، بەڵام بەداخەوە ئەو شۆڕشەو شۆڕشی بەدرخانییەکان، (شۆڕشی یەکەم و دووەمی6 /1843ز)، ڕاپەڕینەکانی یەزدان شێری ساڵی (1853ز) و ڕاپەڕینەکانی دەرسیمی ساڵەکانی (1877و 1878ز)، ڕاپەڕینی عوبەیدوڵلای نەهریی ساڵی (1880ز)، لەکوردستانی باکوور..

هەروەها ئەو شۆڕشانەش کە لەکوردستانی باشوور هەڵگیرساو لوتکەی ئەو شۆڕشانەش لەو چەرخەی لەبارەیەوە دەدوێین، شۆڕشی شێخ مەحمودی حەفیدە لەلیوای سلێمانی، کەوەک مەلیکێکی کوردستان لەساڵی (1919ز)دا خۆی ڕاگەیاند، پاش ئەوەش شۆڕشی دووەم ساڵی (1923ز)و شۆڕشی سێیەم ساڵی (1930ز)، هەروەها ئەو شۆڕشە گرنگەی تر کەئەویش شۆڕشی بارزانییەکانە کە بەدرێژایی سەدەی بیست و تا ئێستاش بەردەوامە.. پێش ئەوانیش ڕاپەڕینی عەبدولڕەحمان پاشای بابان لەناوچەی سلێمانی لەساڵی (1788ز)و شۆڕشی محەمەد پاشای ڕەواندوزی کەسەربەخۆیی میرنشینەکەی تێدا ڕاگەیاند لەساڵەکانی 1826-1830ز دا.. سەرجەمی ئەو شۆڕشانەش کە لەکوردستانی ڕۆژهەڵات-ئێران هەڵگیرسان، لەوانەش شۆڕشی سمکۆ ئاغای شوکاک ساڵی (1920-1925ز)، هەروەها گرنگترین شۆڕش، کە لەچوارچێوەی کۆماری مەهابادا دەرکەوت و سەرۆکەکەی قازی محەمەد بوو لەساڵی (1946-1947ز).. کەواتە بەرخۆدانەکان بوونیان هەبووە و دڵەکانیش پڕ لەهیوابوون.. کاتێکیش زۆربەی دەوڵەتان پێکهێنران و کیانێکیان بۆ دروستبوو و سەربەخۆییان درایە بەبێ ئەوەی بەهیچ شێوەیەک وەک کورد نە لەنزیک و نە لەدوور بجەنگن و شۆڕش بکەن، کوردیش کەگەلێکی دێرینە لەڕاپەڕین و شۆڕشکردنداو خاوەن نەفەسێکی درێژخایەن و دان بەخۆداگرەو خاوەنی سەرجەم بنەماو سیفەتە نەتەوایەتییەکانیەتی و بەدرێژایی هەزاران ساڵیش لەسەر زەوییەکەی خۆی دەژی، لەگەڵ ئەوەشدا سەرجەم ئەو وڵاتە نوێیانەی تازە دروستکران و پێکهاتن ئەوانیش لەهەمان ئاوازی نەتەوایەتییان دەخوێندو هیممەتیان دەکردو بانگەشەی یەکگرتن و پێشکەوتنیشیان دەکرد، کە لەڕاستیشدا سەرجەم ئەو دەوڵەتانە/ ئەو گەلانە تازە بەو ناوچانە ئاشنابووبوون و خەڵکی ناوچەکە نەبوون.

بەڵام عەقڵییەتی دواکەوتوویی دوژمنان، داگیرکاران و کۆلۆنیالیستەکان کەتا دوێنێ ڕزگارکەرو ئەمڕۆش داگیرکارانو کۆلۆنیال بوون، ئای چەند جیاوازییان هەیە-زیاتر لەحاڵەتی یەکەمجاریان یاریی بەگەردن دەکەن.. هەروەک پەندە کوردییەکە دەڵێت: (وەک مریشک بۆیان هاتنە هێلکە)، کەبیانییە ڕۆژئاواییەکان لەدەست عوسمانییەکان ڕزگاری کردن تا بەناشیرینترین شێوە لەگەڵ کوردا مومارەسەی سادییەت و هۆزگەرایی خۆیان بکەن، تا وای لێهات مرۆڤ خۆزگە بەڕابردوو بخوازێت، ئەگەرچی عوسمانییەکان بەناوی ئیسلامەوە حوکمی ناوچەکەیان دەکرد، بەڵام داگیرکارانی بیانی کەخۆی لەئینگلیزەکان و فەرەنسییەکاندا بینییەوە بەناوی ڕیفۆرمخوازی و دیموکراسییەتەوە حوکمی ناوچەکەیان گرتەدەست و حوکمیان دەکردو ڕێیان بەکەمێک سەربەستی دەداو دانیان بەمافەکاندا دەنا، بەڵام ئێستا هەڵمەتی دڕندانە دژ بەکورد لەسەرجەم پارچەکانی کوردستاندا دەستیپێکرد، کەسڕینەوە و ڕەفزکردنی ئەویترو تواندنەوەو گۆڕانکاریی کولتووری و مێژووییان دەستپێکرد، تا وای لێهات کورد بەنیشتمانەکەی خۆیان بێگانەو نامۆ بوون و سەرجەم هیواو ئاواتەکانیشیان پووچەڵکرایەوە ودژایەتیی ڕۆشنبیری و کولتوورەکەیان کراو زمانەکەیان قەدەغە کراو ناسنامەشیان لێ سەندرایەوەو ڕق و کینەو زوڵم و زۆرداری و پشتگوێخستن، سەندنەوەو داننەنان بەسەرەتاییترین مافیشیاندا دەستیپێکرد..

لەپاش چارەکی یەکەمی سەدەی پێشوو کورد دەردیسەریی زۆری چەشت، ئەو ڕق و کینەیەی کەدوژمنان بەرامبەر ڕابردوو هەیانبوو بەکوردیان دەرشت و قەرەبووی سەرشۆڕی و ملکەچکردنەکانیان بەسەرکەوتن بەسەر کوردا دەدایەوە، وایان ڕادەگەیاند کەکورد هۆکاری ئەو نەهامەتییانە بووە کەبەسەریاندا هاتووە، لەگەڵ ئەوەی کورد دانیشتووی ڕەسەنی ناوچەکە بوون، بەڵکو یەکەم کەسیش بوون کەدژ بەدەسەڵاتداریتیی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی و تورکە عوسمانییەکانیش جەنگان، لەناوچەی (کلس)و لەسەدەی حەڤدەدا بوو بەسەرکردایەتیی بیت جانبولات، کەئەوەش پێش یۆنانی و بولگاری و ئەرمەنییەکان بوو کە لەلایەن ڕۆژئاوای مەسیحییەوە پشتیوانی دەکران، کەنازانرێت چەندین نەتەوەی تر کە لەژێر دەسەڵاتی عوسمانییەکان و سوڵتانەکانیدا بوون، کە لەئازارو ئەشکەنجەو بەکارهێنانی هێز زیاتریان لەگەڵ ئەو گەلە داگیرکراوانەدا بەکارنەدەهێنا..

لەچارەکی یەکەم تانیوەی سەدەی ڕابردوو، کورد بەدەست هاوڕێیانی دوێنێیەوە تا ئەمڕۆش زۆری چەشت، بەدەست داگیرکەرە نوێیەکانیشی و دابەشکارانی زەوی و کولتوور و ویست و ئیرادەشیەوە زۆری چەشت، ئەوانەی کەتا دوێنێ کورد بەخۆنەویستانە بەشداریی شۆڕشەکەی کردن، دەبا هەرچی ڕێوشوێنێکی زۆرداری و ڕەگەزپەرستی و شۆڤێنیی هەیە هەر لەتواننەوەو پشتگوێخستنی هەیە بەرامبەری بکرێت، خۆزگە لەپای ئەو پیاوەتییانەیدا هەرچی ناووناتۆرەو خراپەکاری هەیە دەیاندایە پاڵی، تا پێش ئەوەی کار لەکار بترازێت کورد بێدار ببوایەتەوە تا خۆی لەدەستیان بپارێزێت و پاش ئەوەدەبینی، خۆی دەبینییەوە کەچۆن لەبەرامبەر مرۆڤایەتی و چاکەو پیاوەتییەکانیدا دابەشکارانی چەندە دڕندەو نادادپەروەرن و لەنێوان چوار دیوار- پێنج تێکشکێنەردا بەتەنهاو بێ پشت و پەناو بێ کەسەو هیچ کەسێکیش نییە پشتی بگرێت.

ئەوەی بەسەر نەخشەی سیاسیی ناوچەکەدا روویدا، لەوانە تورکیای تازە دروستبوو، هەروەها شۆڕشی کوردیش بەسەرکردایەتیی شێخ سەعیدی پیران و ئەو نسکۆیەی بەدوایدا هات، هەروەها پاش ئەو هێرشە دڕندانەیەی لەشکری کەمالیستەکان و بەیەکەوە سووتاندنی تەڕوو وشك و کوشتنی بێتاوانان لەپێش تاوانباراندا، تا ترس و تۆقاندن بەناوو واتەوات و دوولّی و راڕایی و نائارامی لەناوچەکەو دڵی کورددا بچێنن، لەپێناو خاڵیکردنی کوردستان لەدانیشتووانەکەی وەك زەوییەکی سووتاو، هەروەك چۆن قەتلوعامی ئەرمەنیەکانیش لەدوێنێی نزیکدا هەرگیز لەبیرناکرێن، لەدەرئەنجامی ئەوانەشدا دانیشتووە کوردەکانی ناوچەکە لەزێدی بابوباپیرانیان و ماڵ و مومتەلەکاتیان بەجێهێشت و رەویان کردو بەهەزارانیان لێ دەربەدەربوون. جا ئیتر کەسانی سیڤل بووبن یاخود شۆڕشگێڕ وچەکدار، یان دەستەبژێر یان سەرەك هۆز، ئەویش پاش ئەوەی ئەو دادگا نادادپەروەرو زۆردارانەی کە بە(دادگای سەربەخۆیی) ناودەبرا، لەبەرامبەر کەمترین گوماندا زۆر بەناڕەوایی حوکمیدەداو سێدارەی هەڵخست و دادگاییەکی ناڕەواو نامرۆڤانەی سەبارەت بەکورد پیادەکرد.

بەو شێوەیەش.. دەستەبژێرو سەرەك هۆزە کوردە شۆڕشگێڕەکان ئەوانەی کە لەلایەن حوکمی عوسمانی و داگیرکارانەوە داواکراوبوون و لێیان بەگومان بوون، سەرجەمی چالاکی و خەباتیان بەرەو ئەو سنوورە تازە داهێنراوانە گواستەوە کەلەژێر ئینتیدابی فەرەنسیدا بوون-کە لەدەرئەنجامی سایکس بیکۆوە دروستبووبوون-ڕوویان کردە سنوورە ئارامەکان و لەنێو کوردەکانی دانیشتووی جەزیرەو ماردین، درێژایی جەزیرەی (بن عومەر-بۆتان)ی هاوسێی سنوورەکەیان بڵاوبوونەوەو نیشتەجێبوون، بەو شێوەیەش چالاکییەکانیان لەمەنفای نوێیان و بەشی ئەولای نیشتمانی دایکیاندا ئەوەش پاش کۆچکردن دەربەدەربوونیان..

ئەوی زانراویشە چالاکی و کردارەکیی شۆڕش و خەباتەکەیان، بەململانێ نێودەوڵەتییەکانەوە بەندبوو، بەتایبەت بەو سنوورەی نێوان فەرەنسا لەسوریاو ئینگلیزەکانیش لەعیراق و راددەی تێکچوون و بەرزونزمکردنی پەیوەندییەکانیان لەنێو خۆیان، یان نێوانی ئەوان و تورکیا، بەتایبەت لەپێش یان کاتی جەنگی جیهانیی دووەم.. لەبەرئەو هۆیەش کاری وشیارکردنەوەو غیرەت خستنەبەر رۆڵەکانی گەل کارێکی بەچێژبوو بۆ هیممەتکردن و بانگەشەکردن بۆ وەلاتانی کۆن و سەرجەم ئەو بیرە شۆڕشگێڕییانەش کەپێشتر بەلەدەستدان و پشتگیریی فەرەنسا، بەو شێوەیە سەرجەمی ئەوانە یەکیان گرتەوە کەکەسانی شۆڕشگێڕو بەتواناو لێهاتووبوون لەپێناو هێنانەکایەی بیرە پێشکەوتنخوازو هاوچەرخەکان، لەنموونەی ئەوانیش خێزانی بەدرخان و دکتۆر نافزو برا چوست و چالاکەکەی (د.نورەدین زازا)و هۆنەران و ئەدیبانی وەك جگەرخوێن و ئوسمان سەبری و رەشید کورد و نامی و تیریزو هەر لە(راس العین)ـەوە تادەگاتە دیریك و شام دابەشبوون، کەئەوانە کەسانێك بوون لەبارەی رۆشنبیری و زیندووکردنەوەی زمان و ئەدەبی کوردی و لەبواری کردنەوەی قوتابخانەو بڵاوکردنەوەی زانیاری و زانستی لەپێناو هەستانەوەیەکی سەرتاسەرییدا بەهەڵمەت و چوست و چالاك و بەتوانابوون..

*     *     *

بۆ باسکردنی جگەر خوێن ، پێویستە سەرجەم لایەنەکانی ژیانی باسبکەین، جا ئیتر رۆشنبیری بێت یان ئەدەبی، ریفۆرمخوازیی کۆمەڵایەتی یان سیاسی و نەتەوایەتی و جیهانی و سۆسیالیستی بووبێت، بەو شێوەیەش جگەر خوێن بەوە ناسرابوو کەکەسێکی خاوەن سیفەتێکی شۆڕشگێڕو رۆشنگەرا بووە، لەبەرئەوەی خاوەن پرۆژەیەکی رزگاریخواز بوو و هەڵگری پەیامێکی مرۆڤایەتیش بوو، هەروەها لەبەرئەوەی بڕوای بەبرایەتیی مرۆڤ و سەرکەوتنی خێر بەسەر شەڕدا هەبوو.. هەروەها باوەڕی بەئاشتی و یەکسانی بوو لەپێناو خۆشەویستی و یەکێتی و زانست و بەهاکان و رزگاری و سەرفرازیی ژنان لەکۆت و بەندو کۆیلەکردنیاندا بانگەشەی دەکرد.

جگەرخوێن لەماوەیەکدا ژیا کەگەشترین و رۆشنترین ماوەکانی شۆڕشی کورد بوو کەپێیدا تێپەڕی، بەشێوەیەك بەچاوی خۆی هەڵگیرساندنی شۆڕشە گەورەکانی بینی، هەروەها گەورەترین ئەو خەونەی بینی کەئەویش دروستبوونی کۆماری کوردی بوو لەمەهاباد، هەروەها بەهیوایەکی گەورەی ئەو بەرخۆدانانەی سەرەتاو سەرجەمی راپەڕین و بزوتنەوە رزگاریخوازەکانی تریشەوە ژیا، بەڵام بەداخەوە سەرباری ئەوەش ململانێ سیاسییە نێودەوڵەتییەکان و پیلانەکانیان و پەکخستن و خنکاندن و تێکشکاندنەکانی ئەو راپەڕین و شۆڕشە هەڵگیرساوانەشی بینی، کەچۆن دەستی درێژی دوژمنان گەمەی پێ دەکردن، هەروەها ئەو بەرژەوەندییە هەنووکەیانەی وڵاتە زلهێزەکانیشی بینی کەلاف و گەزافیان بەماف چارەی خۆنووسینەوە لێدەداو وبانگەشەی داننان بەمافەکانی مرۆڤیان دەکرد، هەروەها درۆگەورەکانیان و رەنگکردنی راستییەکانیشیان، کەچۆن گشتی هەڵدەخەڵەتاند بێ هیچ بەرو بوومێك.

بانگەشەکانی جگەرخوێن تایبەت نەبوو بەچین و توێژێکی تایبەتی کۆمەڵ، بەڵکو سەرجەم کۆمەڵگای هاندەداو پشتگیریی دەکردن، هەر لەبزوتنەوە سیاسییەکان و بەگ و ئاغاو شێخانی تەریقەت و مەلاکانەوە تا بەجووتیاران و کرێکارانی و هەژارانی دەگەشت، کەپێدەچێت ئەو بیروبۆچوون و ئایدیۆلۆژییەی هەیبووە گشت کۆمەڵگای لەچێوە نابێت، لەبەرئەوەی ئەو بانگەشەی بۆ رزگاربوون لەرابردوو و وەدەستهێنانی سەربەخۆیی دەکرد، رای ئەویش وابوو کەرزگاربوونی یەکجارەکی بەتەنها لەبڵاوبوونەوەی زانست و سەربەخۆیی ژناندایە، لەدەست گێچەڵەکانی دابەشکارانی کوردستان، پاش خەملاندن یاخود زانینی ئاستی ئەو غوبنەی

دەرحەق بەگەلەکەی دەکرێت، بەوەی گەلەکەی یەکەم بەرپرسی خراپبوونی ڕەوشی کوردیی نییە، بەڵکو لایەنێکی بۆ ئەو هۆکارانە دەگەڕێتەوە کەپەیوەستە بەو شتانەی لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی و ململانێ سیاسیەکانییەوە کاریگەرییان بەسەرییەوەیە، هەروەها بەو شۆڕشە هەڵگیرساوە سەرکوتکراوانەش بەخراپترین شێوە، سەرجەم ناوچەکانی کوردستاندا پەیوەستە، کەکورد تیایدا ژیاوەو بەئاگرەکەی سووتاوە، جا ئیتر لەکوردستانی تورکیا بووبێت لەنموونەی شۆڕشە بەدوا یەکەکانی وەك شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران و ئیحسان نوری پاشاو دەرسیمی شێخ ڕەزا، یاخود بەشۆڕشەکانی کوردستانی عیراق لەنموونەی شۆڕشی شێخ مەحمودی حەفیدو شۆڕشی بارزانی، یاخود بەو شۆڕشانەش کە لەکوردستانی ئێراندا هەڵگیرسان وەك شۆڕشی سمکۆ ئاغای شوکاك و کۆماری مەهاباد..

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا کورد نائومێد نەبوو و لەبانگەشەو هەوڵەکانی تاقەتی لەبانگەشەکانی بۆ هەستانەوە نەچوو، ئەویش لەبەرئەوەی باوەڕی بەسەرکەوتنێکی بەرچاوو حەتمیی هێزەنیشتمانییەکان و وەدەستهێنانی ئاشتی وبرایەتی هەبوو، هەر بۆیە شەوو ڕۆژ بەهەموو توانای خۆیەوە تێدەکۆشاو لەشۆڕشە تراژیدییەکانی ڕابردوویشی پەندو وانەی گونجاوی لەو شۆڕشانەو لەئەزموونە تاڵەکانیش وەردەگرت کە بەدرێژایی مێژوو و بەدوا یەکدا بەسەری هاتبوون، باوەڕیش وابوو کەکورد بەزانست و یەکێتی و یەکخستنی ڕیزەکانی دەتوانێت ئەوەی دەیەوێت وەدەستی بهێنێت و بەسەر دوژمنەکانیدا سەربکەوێت، ئەو دوژمنە چەتانەی گشت پیت و فەڕی وڵاتەکەیان بەتاڵان برد..

بەڵێ.. کورد نائومێد نەبوو، هەر بۆیە لەیەك کاتدا چەندین شۆڕش لەسەرجەم ناوچەکانی کوردستاندا کلپەیان سەند، ئەوانیش وەك شۆڕشەکانی شێخ سەعیدی پیران و ئیحسان نوری پاشا و شێخ ڕەزا لەکوردستانی تورکیاو شۆڕشەکانی شێخ مەحمود و بارزانییەکانیش لەکوردستانی عیراق و لەئێرانیش شۆڕشەکانی سمکۆی شوکاك و شۆڕش یاخود کۆماری مەهاباد، هەروەها لەکوردستانی سوور یاخود لەکەرەباغیش بەهەمان شێوە.. کەسەرجەم ئەو شۆڕشانەش دامرکێنرانەوەو بەئامانج نەگەیشتن و ویست و ئارەزووەکانیان نەهێنایە دی.. لەبەر ئەوە هەمیشە سوور بوو لەسەر یەکگرتن و جەنگین و شەڕکردن لەپێناو دەوڵەتێك کەسەرجەم پارچەکانی کوردستان لەخۆبگرێت، کەبێگومان ئەوەش جگە لەکچ و کوڕەکانی ئەم میللەتە کەس توانای ئەوەی نییە ئەو خەونەی بهێنێتە دی، ئەو نیشتمانەش کەپێشبینیی دەکەن بەهەمان شێوەی ئەو "بووك"ە وایە کەچاوەڕوانی زاواکەی دەکات..

بەڵکو جگەر خوێن، لەئەدەب و شیعرەکانیدا لەوە زیاتر باوەڕی بەکێشەکەی هەبووەو بانگەشەی بۆ کردووە، کەتیایدا بانگەشەی بۆ شۆڕش دژ بەسەرجەم ئەو کارانەی بەسەرچوون دەکرد، لەبەرئەوەی تاکە ڕێگای سەلماندنی بوونی و هێنانەدیی ویست و ئارەزووەکانی و پارێزگاریکردن لەکیان وناوچەکەی بووە، گەلیش لەلایەن خۆیەوە سەرباری گشت ناخۆشییەکی و لەپێناو بەرخۆدانە سەرەتاییەکانی وەك شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی سەرجەم پارچەکانی کوردستاندا قبووڵ دەکرد، ئەویش لەپێناو لابردنی ئەو غوبن و چەوساندنەوانەی سەری، وەڵامدانەوەشی لەبەرامبەر ڕووداوەکاندا هەبووەو بێدەنگیی لێ نەکردووە، لەبەر ئەوە تەماشادەکەین جگەر خوێن، شاعیری سەرکێش و یاخیبوو و شۆڕش وشاعیری نوێگەری و سەرکەوتن و سەرفرازی بوو..

ئەوەی وتی وتی، بێ ئەوەی ڕۆژێك لەڕۆژان هیلاکبوون و نووچدان بزانێت، کەئەویش بەشێوازێکی ڕاستەوخۆو وتارئامێزو ئاراستەکراوی تایبەت بوو بەجگەرخوێن، هەروەها بەو شێوازە حەماسەتخوڵقێن و کاریگەرە لەسەر وورووژاندنی هەست و سۆزی جەماوەر سەبارەت بەخۆشەویستیی نیشتمان و سووربوون و لەپێناویدا خەباتکردن، کەشێوازێکی ڕاپۆرت ئامێز بوو، واتا بەشێوەی دواندنی عەقڵ و سۆزو ئاشناکردنیان بەکۆمەڵێك ڕاستیی بابەتیی زانراو، کەبانگەشەی بۆ دژایەتیی و یاخیبوون لەعەقڵی چەقبەستوو و تەمبەڵی و کۆنخوازی و نەزانی و دواکەوتوویی دەکرد، هەروەها شۆڕش و یاخیبوون لەدەرەبەگ و ئایین بەشێوە فکری وپیادەکراوەکەی، هەروەها بانگەشە بۆ خەبات و تێکۆشان و پاڵەوانێتی و قوربانیدان بەخود لەپێناو سەربەستیی کوردو کوردستانداو پارێزگاریکردن لەنیشتمان و کەرامەت و مێژوو و بەهاو بنەما ڕەسەنەکانی کورد، هەروەها بانگەشەی سەرجەم کۆمەڵانی خەڵکی کوردی دەکرد بۆ هەوڵ و تێکۆشان لەپێناو پاراستنی نیشتمان و بەشداریکردن لەبەرزراگرتنی شکۆیدا، ئەویش بەهۆشیاری و هەستکردن بەبەرپرسیارێتییەوە، کەبێگومان بانگەشەکانی پێش هەموو شتێك لەخۆیدا ڕەنگدانەوەی هەبوو و بۆ ئەو مەبەستەش شیعرەکانی تەرخانکردبوو لەگەڵ ئەوەی دەقاودەق لەگەڵ ناوەڕۆکیشیاندا هاوجووت بوو، بۆ ئەوەش لەچامەو شیعرەکانیدا گەواهیی ئەوە هەن کەپێش نووسینیان بەکردەوە ئەوەی سەلماندووەو تیایدا ژیاوە..

سەرەڕای زاڵبوونی تۆنی وتاربێژیی ڕاستەوخۆ و ئامۆژگارییە پەروەردەییەکانی و هاندان بەمانای حەماسەتخوڵقاندن-کەئەوەش کەمکردنەوە لەکەسێك و خەوش نییە- بەڵکو لەگەڵ ئەوەشدا خاوەن داڕشتن و ئیقاعێکی تۆکمەو ڕەوانبێژییەکی بەهێزە، کەپڕن لەوێنەو خەیاڵی ئاوێتەی دەوڵەمەند بەماناو دەلالات، کەئەوەش داهێنانێکە لەلایەن بیرکردنەوەیەکی ڕەوانبێژانە و ئەندێشەیەکی ئەدەبیی ڕاستگۆ، بەئاگا لەوەی کەئەو زمانە چەند لەتوانایدایە زاراوەو پێکهاتەکانی دەربخات و بەدەسەڵاتیی هەڵتۆقێنێت، ئەویش بەزمانێکی ڕیزبەندی دوور لەزاراوەی دڕندانە، بەوەش زمانی ئەدەبی و زمانی گشت خەڵکیی پێکەوە کۆکردووەتەوەو یەکی پێگرتوون.. بەو زمانەی کەئێستا قسەی پێدەکرێت و زمانێکی

شیعریی دانپێدانراوە لەلایەن سەرجەم ئەوانەی گرنگیی پێ دەدەن.. هەر بەو شێوازەو بەو زمانەش هەستیکرد کەزۆر کاریگەرەو رەوانەو کاریگەریەکی قووڵی هەیە و نزیکە لەفیترەتێکی راستەوە کەپێویست بەئاڵۆزکاریی زمانەوانی ناکات و زمانێکی فەرهەنگییەو نامۆ و لەنەزانییەوە دا نەتاشراوەو، هەر بۆیە ئەو زمانە بووە زمانێکی میللی و لەلایەن گشتەوە قبووڵکرا.. لای ئەویش ئەو زمانە بووە ئەو ئامرازەی کەگشت هەست و بیرو خەونەکانی پێ درکاند.

* * *

بەڵێ، دەکرێت جگەرخوێن تەنها بەپێی قۆناغێکی پڕ لەڕووداوو گەشەکردنێکی گەورەی رۆژهەڵاتی کوردستانی باشووری رۆژئاوا هەڵبسەنگێندرێت، کەپێویست ناکات بابەتەکە بەپێی قۆناغێکی دیاریکراوی تایبەت بەکەسێکی تایبەت یان کات و شوێنێکی تایبەت وەربگرین و هەڵیبسەنگێنین و لەچوارچێوە گشتییەکەی دابڕین یاخود لەو گەشەو پێشکەوتن و رووداوو بەسەرهاتانەی لەچوارچێوەی مێژووە هاوچەرخ و هاوزەمەن و لێکدانەبڕاوەکانی سەرجەم ناوچەکانی کوردستان و مێژووە پڕ تراژیدییەکانیش لێکیان بکەین، کەبووە هۆی ئەوەی بوو و روویدا، هەر بۆیە ئەگەر بەڕوونتر بدوێین" تا ماڤ کەس لەنەوە بەشەرەفەکانی کورد لەڕۆژهەڵات و رۆژئاوادا نەخۆین و غەدریان لێ نەکەین-کەئایا زیاتر لەوانەی پێش خۆی کێ کاری تێکردو کاریشی لەکێ کردووە، هەروەها لەوانەش کە لەو سەردەمەداو لەو بیروبۆچوونانەی ئەو سەردەمەشدا هاوچەرخی بوون و سەرجەم ئەو گەشەو پێشکەوتن و رووداوە کاریگەرانەش کەپێکەوە جیهان وناوچەکە بەخۆیانەوە بینییان.

هەروەك چۆن ناکرێت گشت ئەو ئەدیب و کەسە منەوەرانەش پشتگوێ بخرێن کە لەبەشی باشووری خۆرهەڵاتی کوردستاندا بوون، بەتایبەت لەکوردستانی عیراق-کەهەندێك کەس بەم زاراوەیە ناویان ناوە-ئەوانەی ئەو روانگەو هیواو ئاواتانەیان لا سەرهەڵداو هەندێکیان پێش خودی جگەرخوێنیش کەوتن، هەروەها ئاستی گێڕانی رۆڵی پێشەنگ لەو بوارەدا بۆ بانگەشەو هەستانەوەو بووژانەوەی هەستی نەتەوایەتی و نیشتمانییان چەند بووە، هەروەها کاریگەریشیان تا چ ئاستێك بووە-بەهەمان شێوەی کەڵە پیاوو منەوەرو بانگەشەکاری دووەم پاش ئەحمەدی خانی، حاجی قادری کۆیی کە لە(1815)دا لەکۆیە لەدایکبووەو لە(1892)یشدا لەئاستانە کۆچی دوایی کردووە-کە لەئاستانە بۆ نەوەی بەدرخانییەکان مامۆستاو پەروەردەکار بوو و بەڕاستی بەگەورەترین شاعیرە کوردە نیشتمانپەروەرەکانی سەدەی نۆزدە دادەنرێت، کەشیعرەکانی تایبەتمەندییەکی پەروەردەئامێزو رەخنەی دروستکەری کۆمەڵایەتییان هەیە، هەروەها شیعرە حەماسییەکانیشی لەورووژاندنی گیانی بەرهەڵستکاری و نەتەوایەتی و هەستی نیشتمانی و بانگەشە بۆ شۆڕشکردن بەسەر دواکەوتوویی و نەزانیدا، ئەو کەسە منەوەرەی کەئەو کاتەی ئەوی تێدا ژیاوە دوای ئەو سات و سەردەمە بووە کەپێشەنگی یەکەم ئەحمەدی خانی (1650-1707)ی تێدا ژیاوە، کەخاوەن داستانێکی بابەتیی وەك (مەموزین)ە، هەروەها (سالم)ی شاعیر (1800-1866) کەشاعیر ساحێبقڕان بووە و لەخێزانێك بووە کەبەناوبانگترین شاعیری هێناوەتە دنیاوە، لەنموونەی: کوردی و حەمدی، کەشیعرەکانی بەنیشتمانپەروەری و باسکردنی جەنگەکانی ئیمارەتی بابان لەگەڵ لەشکری تورکدا بەناوبانگە.

هەر بۆیە ئەو رووداوو چوونەپێشەوانەی رەوشی رووداوەکان ئەو سەردەمە گشت کەسی گرتبووەوەو هەروەها قۆناغەکەش بەبەرخۆدان و ئاڵۆزییەکی درێژخایەن و ناخۆشدا تێدەپەڕی کەئەوەش لەسەر خاکی لەو ناوچەیە بوو کەوا ڕێککەوتوون بەهەمووی بڵێن (میزۆپۆتامیا).. بەشێوەیەك کەناکرێت رۆڵ و کاریگەریی سەرجەمی ئەو کەسە منەوەرانە پشتگوێبخرێت و نەزانرێت، ئەوانەی کەبانگەشەی خۆشەویستیی نیشتمانی و هاوبەشیکردن لەئازارو ئەندێشەکانیان دەکرد-بەلایەنی کەمەوە لەڕووی کوردستانییەوە-کەلێرەدا پێویستە بێ پسانەوەو پشتبەستن بەوەی لەسەرەوە باسکراو بێ هەستکردنێکی سۆزداری بۆیان گەواهییان بۆ بدەین، کەئەوانە کەسانێك بوون لەئازارو ئەندێشەکانی بەسەر ئەم نەتەوەو خاکەدا هات ئەوانیش ئازاریان چەشت-لەسەدەی بووژانەوەو هەستانەوەشدا لێهاتووانە بەئاشکراو نهێنیی لەبانگەشە نەوەستان، لەنموونەی ئەوانیش ئەحمەد موختار بەگ (1896-1935)ی سەرەك هۆزی جاف کە لەشاری هەڵەبجە لەدایکبووە، هەروەها حەمدی (1876-1936) و زێوەر (1875-1948)و فایەق بێکەس (1905-1949)و پیرەمێرد (1868-1950) و چەندنی تریش کە لەبواری شیعری نیشتمانپەورەری و نەتەوەییدا چالاك و لێهاتوو بوون.

هەروەك چۆن بەهیچ جۆرێك ناکرێت بەسەر ئەوەدا رابوورین و باسی هەژاری شاعیر (1902)-لەبەشی رۆژهەڵاتی کوردستان نەکەین و بیری بکەین، ئەو شاعیرەی ئەشکەنجەو ئازارو ناخۆشییەکی زۆری لەپێناو بیروبۆچوون و خۆشەویستیی بۆ نیشتمانەکەی و نەتەوەکەی چەشت، ئەم خۆشەویستییەشی بە (چاوی کاڵ و گەردنی سپیی مەڕمەڕی) بەستەوە و ئەوەی گەلیش هەستی پێدەکات و دەیەوێت لێی هەڵهێنجا.

* * *

قسەکردن لەسەر ئەو کەسە منەوەرو نوێخوازە کۆتایی نایەت.. کەئەوەش ئەو کەسە بوو بەکەسێتیی چەرخی کوردیی نەخشاند و بووە رەمزێك بۆ نوێخوازی و رزگاریخوازی و بانگەشەکارێکی پتەویش بوو کەهەرگیز ناکەوێت و هێوریش نابێتەوە، خۆڕاگرەو گاڵتەشی بەجەنگەکانی دوژمنەکانی دێت، بەوەی چەند خاڵێکی لاوازیان کردووەتە بیانوو بۆ زەفەرپێبردنی کورد، لەبەر ئەوەی باوەڕی وابوو-بەردەوام باوەڕی وابوو-کەسەرکەوتنی کۆتایی ویەکلاکەرەوە بۆ کورد لەپێشەوەیەو بێ گومانە.

بەوەش کوردایەتیی کردە شیعرێکی زیندوو و هەڵوێستێکی جوان و رۆشن و شێوازێکی رووناککەرەوە و پێشەنگ لەناوچەکەدا، کە لەزۆر رووەوە هیواو ئاوات و ئازارەکانی گەلی بەڕوونی و گەورەیی تیادا رەنگدەداتەوەو لەو بارەیەشەوە بەیانێکی نەتەوەیی جوانی بۆ داهێنا، بەو شێوەیەش جگەرخوێن لەپێناو گەل و ویست و ئارەزووەکانیدا دەژیاو بۆ پەیامێکی زیندووش دەینووسی.. وەك ئەوەی جگەرخوێن، لەتەوژمی خوێن و هەناسەدانیدا چەرخی کوردیی چڕکردبێتەوە.

# هەندێ لە شیعرەکانی جگەر خوێن

## هاوار

هاوار هەوار
هاوار هەوار
هاوار هەوار
ڤان دژمنان
قادا مە خوار
هاوار دکم
گەرناس و مێر
کوردێن دشەر
دە رەنگێ شێر
ئێریش بکن
تەڤ وەك پلنگ
ژناڤ خوە دەرخن
وان بجەنگ
هاوار هەوار
هاوار هەوار
ڤان چووچکان
گەنمێ مەخوار
تالان برن
وان دەخل و پەز
چەپەر چراندن
کەتنە رەز
هاوار هەوار
هاوار هەوار
ڤان دژمنان
قادا مەخوار
هاوار دکم
رانابی کبنەس
شێخ و مەلا
وپیرو قەس
بخاچ و خشت
ومزگەفت و دێر
ئەم خستنە
تۆرا نەیێر
هاوار هەوار
هاوار هەوار
ڤان چووچکان
دەخلێ مە خوار
سەد جامی و
دێرو کەنشت
ناقۆس و بانگ
وتیرو خشت
سەد لەك ژ
تیپێن لەم تەرەو
بکێرمە نایێن
تەڤ دەرەو
هاوار هەوار
هاوار هەوار
ڤان دژمنان
قادا مە خوار
بدەست تڤنگ
ئەم هەرنە شەر
بشکێ نەیار
ئەم بدنە سەر
هاوار هەوار
هاوار هەوار
ڤان قومبلان
گەنمێ مە خوار
شەرمە کورێ
میتان و لۆر
قادا مە بگرن
ئەو بزۆر
ناڤدارە کو
گەرناسە کورد
ئیرۆ چمان
...ایین زگورد؟
هاوار هەوار
هاوار هەوار
ڤان دژمنان
قادا مە خوار!
هاوار دکم
گوندو عەشیر
باژاری و
میرو گزیر
دژمن نەخور-
تە هەرنە وا
ئێریش بکن
سێنجا ئەوا
هاوار هەوار
هاوار هەوار
ڤان دژمنان
قادا مە خوار
دژمن بزۆر
و سەر بلند
ژ بەر مە گرتن
شارو گوند
نەنان هەیە
نەوار، نە جی
ناموس نەما
ئاپێ حەجی!
هاوار هەوار
هاوار هەوار
ڤان دژمنان
قادا مە خوار
ئەم تەڤدە رابن
مل بمل
ئێریش بکن
دژمن ژ دل
دەستان بپاکی
بدنە هەڤ
وەلات بهێلن
بۆ خوە تەڤ
هاوار هەوار
هاوار هەوار
ڤان دژمنان
قادا مە خوار
ئەم تەڤ برا
ئۆل یا خوەدێ
جۆتێ خوە
بگهێ سەر سەدێ
ئەم بدنە پەی
گەرناس و مێر
تەڤ هەرنە دژمن
دەنگێ شێر
هاوار هەوار

هاوار هەوار
ڤان دژمنان
ڤادا مە خوار
ئەم پێگڤە وەك
شێرو پلنگ
لسەر چیان
ئەم بدنە دەنگ
خوەش بدنە سەر
پشتا نەیار
بشکێ و بمرێ
کۆلەدار
هاوار هەوار
هاوار هەوار
ڤان چووچکان
گەنمێ مە خوار
سەیدا جگەر
تەڤ بوویە خوین
دیسان لمن
دەربون برین
بشکێ تمی
سەر مایەدار
دلخوەش بژین
ئەم پایەدار
هاوار هەوار
هاوار هەوار
ڤان دژمنان
ڤادا مە خوار

## کی هلگرا ڤی بارێ من...؟

ڤەت نەرم دکی دلێ نەیار
ئەڤ گازیێ و هاوارێ من؟
پشتخوورە بارێ من گران
کی هلگرێ ڤی بارێ من...؟
هەر رۆژو هەر ئێڤارو شەڤ
هاوارو نالین تێن ژ دەڤ
گوه نا دنە دەنگێ مە تەڤ
هەڤال و هەم جیرانێ من
کوردێن نەزان و رێ نەناس
ژارو رەبەن برچی و خواس
پەترۆل دبندە بێ کراس
نابێنی خوەش ڤی کارێ من

بدەست نەیار تۆپ و تڤنگ
بدار دخوازم هەرمە جەنگ
هاوار دکم ڤێرین و دەنگ
شکەستییە ئەڤ دارێ من
گازی دکم کوردێن خەوار
رابن ژ خەو جارەك شیار
هاوار ل دژمن بدنە دار
تەڤ گوندی و باژارێ من
دژمن کو ئەم دەرخن بزۆر
ئاڤێن چەمان ئەم ببنە ژۆر
زازو هەکارو بەخت و لۆر
پر خوەش بکن ڤی وارێ من
ئاڤا بکن خان و سەرا
ئەم تێدە رونن وەك برا
دا خورت بکن زێرو پەرا
ڤی بنگەهێ دیوارێ من
شاهی بکەن ئەم رۆژو شەڤ
ما چان ژ لێڤان بدنە هەڤ
نوو خوەش دبی رەوشا مە تەڤ
جوان دبن داماری من
دا بەل ببن بەیبون و گول
جارەك نەمینن کول ددل
گول بدمە یارێ مل بمل
دل خوەش ببی پێ یارێ من
داخواز چیە ژ سەرخوەبوون..؟!
پەترۆل و هاتن و هەبوون
بدەست مەبن هاتن و چوون
پر خوەش دبن بازارێ من
نوو خوەش دبن داخ و برین
سەربەست و سەر بلند دژین
ئێدی جگەر نابی بخوین
تا کو دژیم یەکجارێ من

## یارا

یارا تە بیاری تژی کول کریە دەروونم!
شەڤ تا بسەحەر نال و گری، خوارو نخوونم
حاشا کو هەبن وەك تە بدیداری و رندی
ئاگەهی، دزانی، دئەڤینا تە چ توونم؟
بەیهوودەمە دان بێ پەرە ئەڤ ژین و جوانی
زەر بوومە سەراسەر، پەلێ پایزێ خەزانی
دەر پێلێ خەم و گرتیێ زیندانێ نەزانی
گۆیا، لجیهان ئەز ئادەمیزادێ هەبوونم
زنجیرێ ستەمکاری لمل هاتنە پێچان
چەند سالە لسەر هەڤ گرتیێ زیندان و پەریشان
بن دەستێ نەیاران، کول و خەم، ڤامجی و لێدان
چل سالە لسەر هەڤ کو بدل خەرقەیێ خوونم

## پەنگە روو

بەژن و بالا پر شرین و
شۆخ و شەنگە، پەنگە روو
تەمبەری وەك شەڤ رەشە
ئەبروو ژ هەیڤ و مانگە روو
لێ ژ چاڤان تیر دبارن
رەنگێ مارن رەش گولی
سەر بسەر سینگێ دە تین
لێ لژورێ شەنگە روو
بسك و جینیك تانگ و تۆپن
شەر دگەل خالان دکەن
هەردوو ئەبروو رەشکەڤانن
لێ دگەل وان جەنگە روو
گەردەن و سینگا سپی
رەنگێ بەرفا سەر چیا
لێ دەمەیدانا ئەڤینێ
پر بناڤ و دەنگە روو
ئەڤ کەزی و بسك و ئەبروو
چاڤ و لێڤ و بەژن و بال
تیپ و تانگ و لەشکەرن
لێ تەنێ سەرهەنگە روو
من درووده رۆنیەك
دی، کو مە سەر دانی لبەر
ڤەنجی و دانا هەبوونە
کێ دییە ئەڤ رەنگە روو؟
خۆشی و شیرانی و رندی،
جوانی تێدە پر
پایەداری، سەر بلندی
ئەز دبێنم هەنگە روو

## تو زانی کا چ دەرمانە

ژ دیدارا پەری رەنگێ
بروو هەیڤێ گولی شەنگێ
ئەی گەورێ وەکی پەنگێ
دنالم ئەز وەکی چەنگێ

بقيرو نال و گريانم
تو زانى كا چ دەرمانم؟
لسەر چاڤێن مە بێ خانم!
ببۆسم ئەز لەبێن لالا
وان لێڤان دنۆشم ئەز
مەكە باوەر لهۆشم ئەز
بريندارو نەخۆشم ئەز
سەراسەر دل بجۆشم ئەز
خەرابانم پەريشانم
تو زانى ماچە دەرمانم
لسەر چاڤێ مە بێ خانم!
ببۆسم ئەز لە بێن لالا
پەريشانم دڤێ بەندێ
ژ دەردێ ڤێ شەكر خەندێ
بەلەك چاڤێ سپى زەندێ
دەسۆژم ئەز وەكى فندێ
لديدارا تە پەروانم
تو زانى ماچە دەرمانم
لسەر چاڤێن مە بێ خانم!
ببۆسم ئەز لەبێن لالا
بديدارا خوە ئەز كوشتم
شكاندن تەڤ مل و پشتم
ژوان تيران كو دل مشتم
سەرەپا ئەز نەخوەش هشتم
دقەيدو بەندو زيندانم
تو زانى كا چ دەرمانم!
لسەر چاڤێ مە بێ خانم
ببۆسم ئەز لەبێن لالا

## دەردا دەروونم

مالا مە خەرابكەر تە بڤێ هاتن و چوونێ
وەر روونە لنك من بەرى بمرم وەرە روونێ
سپێدێ وەرە داتە ببۆسم لخورينى
ماچەك ژ دوو لێڤێن تە، لشوونا قەرەتوونێ
ئەم هاتنە ژينێ ژ بۆ هەڤدى بمژێنن
دلخۆشييە سەرمايێ ڤێ ژين و هەبوونێ
وەك سۆرگولێ رووگەش، كو دژينێدە جوانى
لێڤێن ژ عەقيق كو تە سۆر كرنە ژ خوينێ
بۆچى تو لهەمبەر ڤە دوەستى وەكى رۆژێ
گولێێن زەرە زەيتوونى لپێشبەرمە دهوونێ
گەر ئەز تە دخوازم، ژ هەبوونێ ئەڤە داخواز
سەد داغ ژ نەبوونێ مە كشاندن لدەروونێ
سۆتيمە سەراسەر دئەڤينا تەدە دلبەر
وەر گوه بدە دل قچ-قچە وەك ئارێ قەلوونێ
ماچەك بدە سەيداو بجارەك تو مەغەيدە
سەد حەيفە كو دل كول هەرى بن ئاخ و نەبوونێ
هنگى وەكو ساخە بەرە دلخوش و جوانى بى
لێ كەنگى سەرى دانى بجارەك مەچە شوونێ
سەيدا كو جگەر خوينە تيرێ بروێن رەش
دلژارە لسەر سۆرگولێ دێمێن تە دخوونێ

## ئوجاغە يار

سەربەست كو كەتم ئودەيێ وێ هۆرە-سوشتێ
بێجامێ شەڤێ لێ بوو، سڤك كەتمە تەنشتێ
ماچەك مە ژ لێڤان برو دەست چوونە دو سێڤان
گازن ژ متێلێ دكرن: كێلەك و پشتێ
ئوجاغە، مەسەر دانييە بەر ئەبروێن تووز-رەش
پاراستى ژ چاڤان بتلهم و بنڤشتێ
نارنج و گول و چيچەك و بەيبوون و بنەفشن
من دەست برە ناڤ سينگ و بەران، كەتمە بهشتێ
سووند خوار ژ تە پێڤە كەسى ئەڤ دەر نە پەلاندى
من گۆ: ژ خوە ئەز دچمە جهێن كەس نەگەهشتێ
نێچير مە لدێم و لەب و چاڤو بروان كر
گو: ما نە بەسە، كا ژ چيێ دەركەڤە دەشتێ
من گو: سەرو پا تەڤ پەت ولات و سەنەمى توو
وەك ئاگرێ زەردەشتى د پووتخان و كەنشتێ
باوەر مە بتە نانييە، سەر دانييە بەر پێ
كى سەر نەدى بەر پێ، كو ژ ئەيوانێ بمەش تێ؟
ئەڤ بوون و نەبوون، تەڤ ژ تەرا ژێدەرو ديدار
ئەڤ خۆشى و نەخۆشى، ژوان چاڤێ كە لەش تێ
ژينا تەيە، ڤينا تەيە، دينا تەيە جانا!
ژ دل و جانێ جگەرخوين رە گەلەك خۆشى و وەش تێ

## يار هات جڤينا من

يار هات جڤينا من بشەڤ
شەبنەم ل نەسرينان رژى
چيچەك وەشاندن وێ بدەڤ
سونبول ژ شەرمان راهەژى
نێرگز ببەيبوونان كەنين
سۆرگول ژ لێڤان پشكڤين
چۆل تەڤ لبەر پێ بوو بەهار
هەر دەر ژ بينێ ماتەژى
مرى ل بێژنێ رادبن
چقلى و كاتك تێن سەما
بايێ نەسيم ڤێرە دچى
ژالە ب رەوش و پاقژى
دۆزا جوانێ جانە، لێ
جاما لە بالەب دايە من
ماكى ژ لێڤێ ئەرخەوان
جاما شەرابێ نامژى؟
جاما شەرابا لال و در
من لێڤ بسەر لێڤان دەبر
سێ سەد قەدەح من ژێ ڤەخوار
تينا دلێ من ناكوژى
دلخوەش دبوون، روو گەش دبوون
بێ هش دبوون، سەرخوەش دبوون
بێ ژين و ڤين و لەش دبوون
ئێ يار بدەست كەت كا مەژى؟
پشتى گهام ئاڤا حەيات
بهش خوە هاتن تەڤ لەبات
مێتن ژ دەڤ قەندو نەبات
بهشتە ئەڤ شەڤ هەر بژى
پشكۆژێ ڤێ ژينێ ئەمن
بەيبوونێ چێبوونى ئەمن
دلسۆژێ ڤێ چوونێ ئەمن
لێ هێژى جاندار نا پژى
بۆچى دبن پەردا شەڤێ
بگهێمە ڤێ شێرين دەڤێ
وێژى وەكى من ئەڤ دڤێ
دا كو بشاد و خوەش بژى

## ب نۆرە بخوينە ڤێ نامێ

وەرە بايێ سپێدێ خوەش
ژ دەستێ من بگرە ڤێ نامێ

بده دەستێ سپی زەندێ
شەکەر خەندێ، بلندقامێ
ب زانینو ب تۆرە خوەش
بخوینە نامەیێ ژێرە
دبی ناڤێ مە بێتە سەر
زمانی شاهە بەهرامێ
ببێژە: گرتیێ بسکێ
تە تم ژارو بریندارە
رها و بەندەوارە ئەو
قەلابەندە دنێڤ شامێ
دخوازی پرسەکێ لێکی
ژویرە بەرسڤێ رێکی
ژوان لێڤو دەڤێ شێرین
بشێنە ژێرە پەیخامێ
ل ژینو رەوشو پەرگالێ
بپرسە جارەکێ سالێ
ببێژە کو شەڤو رۆژان
ژ تە دەستێنی ئیلهامێ
دزیندانێدە روونشتی
دکی گازو گلی هەردەم
کو دنڤیسی ب خوینا دل
ل هەر دیوارو هندامێ
ئەگەر بێژی چیە داخواز
کەسێ ژارو بریندارە
ببێژە کو دڤێ جارەك
ژڤان دەستان ڤەخوی جامێ
ل سەر ئاڤان، ل ناڤ باغان
ڤەخون مەی، گوە بدن زاخان
درستە چەنگەك ژ ئاخا بەر
دەرێ دلبەر ب بۆسم ئەز
ژ دەرێ نرە دێ خوەش بێ
گەلەك بێتر ژ پەرشامێ
ئەگەر دلبەر دخەودا بێ
ب نەرمی بگرە سەردێمان
خوە بەردەسەر دەڤو لێڤان
تو وان دێمێن وەکی سێڤان
تو رامووسە، سەلاڤێن من
بدە وێ شۆخ و دۆمانێ
ژوان لێڤێن شرین جارەك
ژ بۆ من پرسەکێ بینە
دنێڤ لیزا ئەڤینێ دە
دو بەرکێن من هەرن دامێ
دبی ئەو شاهو کەیخەسرۆ
بجارەك من بکی ئازاد
کو سەر دەینم ل بەر لالەش
بکم هەی، هەی دهنگامێ
دەرێ مەیخانەیێ روونم
مەیێ فرکم ب سەربەستی
ل سازێ گوە بدێرن ئەم
بکن نالین دگەل خامێ
جگەرخوین شاهو خونکارە
کو جارەك دەست بدی یارێ
ب هەڤرە هەرنە سەیرانێ
ب ڤێ تەکتیكو بەرنامێ

## مە دل دایە بەر تاڤێ

بسەربەستی وەرە پەردا خوە پاڤێ
ئەژی وەك تە مرۆڤم پۆر بەلاڤێ!
وەرە پێکڤە بچن نێڤ باغو داران
بدێرن گوە لدەنگێ باو ئاڤێ
ژ هەڤدی رە کو چێبوونە ژنو مێر
هەبوونەك دووری هەڤ بن، قەت مە نا ڤێ
ژ بەر خوینا منە لێڤێن تە سۆرن
ژ خوەدانا تە یە شووشا گولاڤێ
ژ تاڤا هەردوو دێمان دل بپێتە
ژ بەر سیکێ نەڤێم کو هەرمە تاڤێ
ددیدارا تەدە هاتم پشافتن
لوێ ئاڤێ وەکی مرغێ دداڤێ
کەتم گۆلا ئەڤینێ کورو بێقام
ژ تە پێڤە کیە بێنی پەراڤێ؟
نەخۆشو باوێو تاوێ، مەپرسی
دبێژین: کو دڤێتن گەرمە ئاڤێ
تەنێ زانم کو دەرمان گەورە شەنگە
بوێ شین تێ بهارا دل، دگاڤێ
وەکی بازێ بەلەك وەرە سەر پەرێ من
تە باڤێژم جزیرا ناڤ گراڤێ
بەرە کەس مە نەبینی، دووری دەست بن
بەرە دژمن ژ دەخسان بەرخوە باڤێ
تە دێم دانەو بسکێن رەش ژ داڤان
مە دل چوو دانکێ لێ کەڤتی داڤێ
لبەر مالا مەو وە بوویە گوڤەند
دبێن رێ بدنە بووکێ، بدنە زاڤێ
خوەزی رۆژا کو ببنە بووكو زاڤا
لسەر چاڤێ مە بێ تەڤلی پێلاڤێ
ژوان لێڤێن شێرین جامەك بنۆشم
وەکی تێهنی خوە باڤێژم دئاڤێ
ژ بوستانێ تە بگرم ئەز دوو سێڤان
کو دەستێ من هەرن وێ پەهنەناڤێ
ببم تالانێ زالێ زەنگو زێرین
بهشتا پشتی ژینێ قەت مە ناڤێ
پەری ناڤێم، کو لێڤ سورەك لبا من
تەنێ تشتەك بدەست نایێ بلاڤێ
وەرە هەمبێز بکن ئەم هەڤ بشادی
بەری دژمن مە تێخی بەندو داڤێ
تو رۆژی دل دسۆژی، لێ مەترسە
جگەرخوین هشكو خۆرتە وەك بەناڤێ

## هۆ هۆ شڤانۆ

هۆ هۆ شڤانۆ، هۆ هۆ شڤانۆ
دل بکولو، بکوڤانو!
تۆ پەز بەردە پشتا سوورێ
دەست باڤێژە سەر بلوورێ
بەلکی مللەت ژ خەو رابی
دکم ناکم شیار نابی
لپاش مایە هارو گەرمە
نە وەك پەزێ تە روو نەرمە
برۆژ پێدە دڤێ رازێ
قەت گوە نادی بەر ڤێ سازێ
مرۆڤ گهانە سەر هەیڤێ
باوەر ناکن ژمن پەیڤێ
وەکی لۆکە دچی درێ
هەڤسار بکورتانێ کەرێ
کۆرە لپەی کۆران دچی
رێبەر مەلا شێخو حەجی
هۆ هۆ شڤانۆ، هۆ هۆ شڤانۆ
دل بکولۆ، بکۆڤانۆ
پەزێ خوە زوو بەردە چۆلێ
کاشۆ بگرە وەرە هۆلێ
گۆکێ بدن ئەم بەر شەگا
دەرخن ژ ناڤ خۆ ڤان بەگا
ئەو رێبەرو دوستێن نەیار
چەند سالە ڤان مالێ مەخوار
بوون رێبەرێ مللەت هەمی

نائين دەلاڤێ، وان گەمی
زمان‌و قاد هشتن بەیار
پێشکێش کرن دەستێ نەیار
بئۆل‌و عێل خستن دخەو
هەتا کو ئەم بوون چێلەکەو
هەتا کو رێبەر بی عەلۆ
وێ خوارنا کورد بی چلۆ
هۆ هۆ شڤان، هۆ هۆ شڤان
ئەم بەندەیێ دەنگێ تەمان
دەنگێ بلووریێ پر خوەشە
پێ خوەش دبن جان‌و لەشە
گڤگڤ بکە هەردەم لگوند
بێنە سەما تەڤ گەورو ڕند
لێڤ سۆرو دێم گول یێن سەما
دەرخن ژ دل دەردو خەما
پەردا رەش‌و خەمری‌و فۆت
راکن ژ سەرخوە بێن بلۆت
لێخە تو سازا جەنگ‌و شەر
دا خۆرت بهاوێر بێنە دەر
بگرن بهۆراڤێژو تۆپ
ئێریش بکن ئەو قۆپە- قۆپ
بشکی ژ بەر وان تم نەیار
مللەت ژ خەو رابت شیار
هۆ هۆ شڤان، هۆ هۆ شڤان
ئەی دل بئێش‌و دەردو ژان
وەك تە شڤانم ئەی هەڤال
بلوور شکەستی، نینە مال
ئێرۆ قەلەم ئاوازو ساز
ئەز بوومە وەك نیڤ بورجەواز
تێم دچم ئەز رۆژو شەڤ
قاتان دهژمێرم بدەڤ
نە پەز هەیە، نە ژی بلوور
بدەڤ دکم ئەز لوورە- لوور
لێ کەس دڤان رۆژو شەڤان
گوه نادی بەر دەنگێ شڤان
زانم سیاسەت تەڤ دەرەو
دڤێ کو کورد رابن ژ خەو
دەستان بدن تۆپ‌و تڤنگ
لسەر چیان قێرین‌و دەنگ
ژ ناڤو لێت دەرخن نەیار
قادا مە نامێنت بەیار
هۆ هۆ شڤان، هۆ هۆ شڤان
کورد بەندەیێ دەنگێ تەمان
لێخە لبەر لاتێ بلوور
هشیار بکە هۆڤو تلوور
تو بوەرین تلیێن قەلەو
دا کورد شیار بن تەڤ ژ خەو
گوه بدنە ڤێ سازێ ژ دل
خوەش ناس بکن رازێ ژ دل
کا چ دبێژن ئەڤ بلوور؟
داخواز چ قاسی کوورو دوور؟
دلسۆژە ساز تەڤ دەردو خەم
شانی ددی زۆرو ستەم
تەڤ کوشتن‌و تالان‌و شین
چەندان دناڤدە تێ ئەڤین
سازا تەبە جەرگێ مە سۆت
خۆرتان د چەلقێنی بلۆت
خومخوم دکی رەنگێ چەما
بسك‌و کەزی پێ تێن سەما
دەنگێ بلووریێ پر بتین
جەرگ‌و هناڤ من کرنە خوین
هۆ هۆ شڤان، هۆ هۆ شڤان
کورد بەندەیێ سازا تەمان.

## دخەونێن شەڤاندە

دنێڤ خەونێن شەڤان دلبەر دبێنم
لدێمان ئایەتا ڕندی دخوێنم
ژ تۆڤێ مسکێ بسکێ، دانە دا من
ژ بو کو ئەز دنێڤ دلدا بشێنم
کو شێن بێ لێ بنێرم، بین بکم ئەز
کو تم بسکان دبیرا خۆ وەرێنم
دەما رابم ژ خەو سەرمەست‌و گێژم
پەریشان‌و نەخوەش، بێ وەش دمێنم
دخوازم کو بدیاری بدمە یارێ
نزانم، بکێرە ئەز بشێنم
چ بێژم پیرو کال‌و شەرمەزارم
دڤێ رێدە دڤێ پەردێ هلێنم
بەرە هەرکەس بمن قەرفا بکی بەس
لجەم دلبەر تەنێ شێرین بمێنم
خوەدێکی ڤەت مەبێژە کالە سەیدا
جوانم دل شیارم تەن ب تێنم
سەری چەندان سپی بوویە، بەلێ ئەز
وەکی گوندەك مەزن ئاڤا و شێنم
جیهان پێکڤە کول‌و خەم بن ددلدە
بیەك ماچێ ئەزێ وان ژێ دەرێنم
ئەگەر دلبەر ژ دل دەستان بدی من
ئەزێ ئەیوانێ ژێرە نوو ڤەژێنم
ئەگەر شێرین، لەبێ شێرین بدی من
وەکی خەسرو جیهانێ راهەژێنم
وەرە مەیگەر، بدە جاما لەبالەب
کو تۆزا بەندەواری دوەشێنم
دەلالا من دناڤ دەستێن نەیارا
دخوازم وێ بزۆرێ راکشێنم
مەبین سەیدا جگەرخوین پیرو کالە
دڤێ نەمرم هەتا دلبەر ببێنم

## کوردستان

بلندە بەژن‌و بالا تە
ل سەر تاجا تە ئەسمانە
کتانەك رەنگ سپی دایە
سەرێ زۆزان‌و سیپانە
ل ژۆرێ کانی‌و جۆبار
وەکو هێستر دبارن خوەش
ل ژێرێ تە دبێنم ئەز
بهەشت‌و باغ‌و بستانە
کراسەك ئەتلەسین کەسکە
ب رەنگێ رۆژێ نەخشینە
ل بەژناتە دبێنم خوەش
ب سورمە شال‌و میتانە
چ رەنگ شێرینە یارا من
شەپال‌و نازك‌و شۆخە
فەرات‌و دیجلەو خابوور
ب سەر بەژنێ دە بەردانە
ژ خوینا من تو لێڤ سۆری
ژ بینا من گولا جۆری
تەنێ من بازنێ زەندێن
تە زنجیرێن دلنگانە
ئەڤینا تەکرم شەیدا
بریندارو پەریشانم
ژوان لێڤێن شێرین ماچەك
ژ دەردێ دل رە دەرمانە
بریندارم ب تۆپێن
ئاورێن چاڤێن بەلەك ئێرۆ

وەرە دلبەر کو دەستێن تە
ژ ئێشا منرە لوقمانە
ب پیری ئەز دخوازم کو
ببم زاڤا تو چ دبێژی
نە خەونە کو دبێژم ئەز
نەساویرو نەگۆمانە
تو نابێنی ب گوڤەندا
مەدا هەرکەس دچی و تێ
ل هاویر شاهی و جەژنە
سەماو گەرو دیلانە
قەلەن خوینا منە چبکم
دڤێ کو ئەز بدم جارەك
مەگەر جان و جگەر دەینم
دڤێ رێدە چ ئەرزانە
چ زان روومەتا ڤێ شەنگ
و شۆخێ بەگلەرو پاشا؟
ب قوربانا تە بن جانا،
هەزار میرو بەگ و خانا
ئەزم گو تە ژ دەستێ
دژمنان دەرخم ب مێرانی
ل سەر سینگا تە سەربەست بم
بپارێزم تە مەردانە
مەگەر دوورو رەشە رێچك
ل هاویر دوژمنێن خوین رێژ
مەکە باوەر بترسم ئەز
ژ سەهپا و ژ زیندانە
سەری من دانی یە ڤێ رێ
دڤێم بگهێمە ئارمانجێ
مەبێژە کو: گەلەك فەرسەنگ
ژ دەستێن خۆ وە بەردانە
دخوازم ترس و ساویرو
فەن و خاپان ژ خوە دوورخم
بزانە ئەڤ قەرێژا کورد
نەیا چەند ماهو سالانە
هەچی چوویێ مەدە پەی وی
ژ من گازن مەکە نازك
مە ترسە هێ ژ بۆنا مە
دەمێن خورت و مەزن مانە
هەزار سالن مەژی بوویە
قەرێژ هێ نوو ژ خەو رابوون
دخوازن وی بشوون جارەك
مە رێبەر پیرە- رێزانە
چەکا من زۆرو زانینە
ب بیرو باوەرو داخواز
ب تووژ ئاور دنێرم ئەز
ل کەڤنە شارو ئەیوانە
سویسرا رۆژهلاتی خوەش
ب شیرانی و نازداری
ژ جۆبارێن تە ئەڤ هندام
بجارەك تێنە ئاڤدانە
مەبێژە: پاشدە ماین کورد
کورێن کەسرا سەری هلدان
ل سەر شاخ و چیان لاوان
دەرەفشا کاوە هلدانە

## ژ ترسا،
## زانا خوەدێ برنە ئەسمانا

دەمەك ئەز دەرکەتی بووم
بەلکی ژ دەرب کەتی بووم
درەڤیام گوند بگوند
خوە ڤەدشارت وەکە کوند
مەلاك هەبوو لە باژێر
بقەرێژو خوەدی خێر
بخانی و خوەدی مال
بدکان و بپەرتال
یانی برچی، نە تێر
مالا وی بوو شەڤ بوێر
گەلەك جاران دچوم جەم
درەڤاندن کول و خەم
دپەیڤین ژ کەڤنار
هەم ژ ئاش و ژ باژار
دۆستێ منێ نمێژکەر
تسبی، سیواك تم لبەر
نمێژکەرو رۆژیگر
دۆزا کوردیتی دکر
ئەگەر دەرەو ئەگەر راست
خوە ژ چاڤان د پاراست
باوەر دکر مال بدین
تێ کومکرن، تێ جڤین
من ژ وێرە تم دگۆت
بەسە تە مالا خوە سۆت
چ نمێژو رۆژینە
چ سیواك و تسبینە
هەمێ چیرۆك و دەرەو
مە ژ دژمنرە دخن خەو
لێ ئەو بمن دکەنی
تەنێ دگوت ئەز بەنی
تو پر قەنجی جگەرخوین
تەنێ ئێریش مەکە دین
رۆژی نمێژ پر باشن
بێ زیانن بەلاشن
راستە، دەرەو، ئەم دکن
دلێ خوە پێ خوەش دکن
چەند سال دوێ ناڤێ چوون
زوو ووندا کر ئەو هەبوون
وەکە من ما بێ قەرێژ
بەردا وی رۆژی و نمێژ
د سەرمەرە بۆرین سال
ژ زیندانێ هاتم مال
رۆکێ هاتە مالا من
پالا خوەدا پالا من
دەم رۆژی بوو رەمەزان
برۆژی بوون تەڤ نەزان
دناڤ واندە ئەم گاور
وەکە درو جەواهر
دەما خوارن هات بەرمن
گو: کا کەڤچی بدن من
وەکە گورێ برچی، هار
مە هەردوان خوارن خوار
من گۆ: سەیدا، گۆ: دەبێژ
کا ئەو رۆژی و نمێژ؟
لمن نەری و کەنی
گۆ: نەزان بووم ئەزبەنی!
پێکەت فەلسەفا خوە گۆت
دل و هناڤ لمن سۆت
مە ئاژۆتە سەر سەدێ
هەتا گهان بال خوەدێ
گۆ: مرۆڤێن پر زانا
خوەدێ برنە ئەسمانا
لێ تەنگ نەکرنە قەفەس
دا نەگهێن دەستێن کەس
ئەگەر لڤر بهشتا
مەیێ ئەو زوو بکوشتا

بەرێ، خوەدێ خۆرمو دار
مە دشكاندو مە دخوار
لێ ژیرەكان ئەو بر ژۆر
ددەست ویدە مایە زۆر
ڤێ گوتنا پر مەزن
ئاگر بەردا دلێ من

## سەرچاوە

جگەرخوێن، ڕۆناك، دیوانا چارێ، هەڤال زاخۆیی، چاپی یەكەم، سلێمانی 2005، لە بڵاوكراوەكانی بەڕێوەبەرێتی گشتیی چاپو بڵاوكردنەوە.



# بۆ تۆ وڵات شیرینتر بوو

جەبار سابیر

یەکێك لەگرفتە سەرەکییەکانی ئێمەی کورد هەر لەدێرەوە تانهۆ نەبوونی قەوارەیەکی سەربەخۆ بووە جائەو قەوارەیە ئیمپراتۆر بووبێت یاخود دەوڵەت، تاڵەو ڕێگەیەوە کلتورو فەرهەنگی خۆمان بپارێزین، لەلایەکیتریشەوە ئەوەی هەشمانبووە بەهۆی لەشکرکێشی ئیمپراتۆرو زلهێزەکانی ناوچەکەو جیهانەوە لەناوچووەو هیچ بۆ ئێمە نەماوەتەوەو سەرباری ئەوەش خۆشمان تانەمرۆشی لەگەڵ بێت ئەوەندە دەربەستی فەرهەنگو کلتوری خۆمان نین‌و تائێستاو دوای نزیکەی پازدە ساڵ ئازادی کوردستان نەمانتوانیوە دەزگایەکی گەورەی ئەرشیفسازی دامەزرێنین بۆ کۆکردنەوەو سەرلەنوێ چاپکردنەوەی میراتی ئەدەبیمان کەتاکە شتێکە ئێمە بەڕابردووەوە دەبەستێتەوەو دەتوانین لای بێگانە باسیان بکەین.

سامانی ئەدەبی ئێمە نەهامەتییەکی تریشی هەیە ئەویش ئەوەیە کەبەیەك دیالێکت(زاراوە) نەنوسراوەتەوەو بەڵکو بەزۆر زاراوەی کوردی نوسراوەتەوە ئەمەش زۆر کێشەی بۆ دروستکردوین چونکە ئەدەبیاتی کلاسیکی کوردی لە(بابە تاهیری هەمەدانییەوە)(عوریان)(935 - 1010ز)، دەست پێدەکات، کەچی تائێستاش فارسەکان خۆیان بەخاوەنی (بابە تاهیر) دەزانن‌و ئەوەندەی ئەوان خزمەتی دەکەن‌و بەتەنگ شیعرەکانییەوەن ئێمە بەتەنگییەوە نین‌و هەرئەوەش داشی فارسەکانی سوارکردووە، ئەمەش تەنیا لەبەر ئەوەیە کە(بابە تاهیر) بەزاراوەی لوڕی نوسیویێتی‌و فارسەکانیش ئەوە بەزارێکی زمانی فارسی دەزانن، (خانای قوبادیش) بەزاری هەورامی نوسیوێتی‌و (ئەحمەدی خانی‌و مەلای جزیری‌و فەقێ تەیران‌و پرتەوی هەکاری)و زۆر شاعیری تریش بەدیالێکتی کرمانجی ژووروو چەند دیالێکتی تر شیعریان نوسیوە.

لەدوای (ئەحمەدی خانی)یەوە (جگەرخوێن) یەك لەوشاعیرانەیە کەبەزاری کرمانجی ژووروو شیعری حەماسەت‌و بەرگری نوسیبێت‌و شیعری وەك گوتاری مانەوەو دروستکردنی هەستی نەتەوەیی بەکارهێنابێت، بەڵام جیاوازی (خانی‌و جگەر خوێن) تەنیا هەرلەوەدا نییە ئەویان کلاسیك‌و ئەمیشیان هاوچەرخ‌و ڕۆمانتیك، بەڵکو کۆمەڵێك جیاوازی هەیە لەنێوان (جگەر خوێن‌و خانی)دا کەلەهەموویان گرنگتر زەمینەو زەمانی هاتنە دنیایانە. (خانی) لەسەردەمی پاشاو ئیمپراتۆرەکاندا ژیاوەو (جگەر خوێن)یش لەسەردەمی پڕ هەراو هوریای دروستبوونی دەوڵەتی نەتەوەییدا، بەڵام خاڵێکیش کەئەم دوو شاعیرە مەزنە پێکەوە دەبەستێت‌و هەردووکیان کۆکن لەسەری دروستکردنی گوتارێکی نەتەوەییە. (خانی) لەخەمی ئەوەدایە کەکوردان هەستی نەتەوەییان نییەو کەسێك نییە ئەو هەستەیان تێدا دروستکات‌و سنورەکانی جوگرافیای کوردستان بکاتەوە بەیەك. بەڵام (جگەرخوێن) سەرباری ئەوخەمانەی (خانی) مەزن هەیەتی لەخەمی ئەوەشدایە چۆن شیعری کوردی هاوشانی ئەو پێشکەوتنە تازانەی دنیا بخاتەڕێ‌و وەك شیعری نەتەوەکانی دەورووبەر بەرەو پێشەوەی بەرێت، بۆیە دەبینین هەرلەسەرەتاوە جگەر خوێن بەرەو تازەگەری دەڕوات‌و لەسەر هەردوو ئاستی فۆرم‌و ناوەرۆك ئەو کارەدەکات.

لەسەردەمی (جگەر خوێن)دا خاکی کوردستان بەواقعی دابەشدەبێتە سەر چوار پارچەو هەر پارچەو بەر دەوڵەتێك دەکەوێت، وەك لایەنی کلتوریش کورد دەبێتە پاشکۆی سێ کلتوری لێك جوودا کەدووانیان (تورك‌و عەرەب) زیاتر گرێدراوی ئایینی ئیسلام‌و تاڕادەیەکی زۆریش بیابان نشینی‌و کێونشینی بەوانەوە دیارەو لەو ناوەدا تەنیا (فارس) شارستانییەتێکی دێرینی هەیەو لەلایەنی داگیرکارییەوە هەندێك شتی بەئێمە بەخشیوە لەناویاندا هونەری گۆرانی‌و مۆسیقایە کەلەئێستادا باڵی بەسەر مۆزیکی ئێرانیدا کێشاوە. شاعیر هەموو زوڵم زۆرەکانی ئەو چوار وڵاتە دەرهەق بەکورد لەسەردەمی تازەی دنیادا دەبینێت‌و ئەوەش دەبینێت کەتازە زلهێزەکانی دنیا بەرژەوەندی چاوی کوێرکردوون‌و گوێ بەوە نادەن کورد چیپێدەکرێ‌و چیلێدەکرێت لەلایەن ئەو دەوڵەتە تازە دروستبووانەوە.

سەدەی بیست وەك چۆن سەرەتای پێنانە قۆناغێکی نوێی شیعری کوردییە، ئاواش گیرۆدەبوونی شیعری کوردییە بەزۆر ئەرك‌و مەسەلەیتر کەوەك بیگارێك وایەو شیعری کوردی ڕایدەپەڕێنی. ئەرکی شیعرنییە مێژوو بنوسێتەوە، ئەرکی شیعرنییە ئامۆژگاری خەڵك بکات‌و شاعیر هەوڵبدات وەك ڕیفۆرمیستێکی کۆمەلایەتی خەڵك بۆ کاری باشە هانبدات، ئەرکی شیعرنییە لاوان بەرەو کۆڕی خەبات‌و تێکۆشان بەرێت، ئەرکی شیعرنییە ژنان پەلکێش کات بەرەو ئازادی‌و بەرابەری لەگەڵ پیاواندا، بەڵکو ئەرکی شیعر تەنیا شیعرەو هیچیتر. کەچی لەبەدبەختی کورد

شیعری کوردی لەسەدەی بیستەمدا هەموو ئەو ئەرکانەی گرتۆتە ئەستۆو زۆرکەمتر خۆی لەقەرەی شیعرداوە لەپێناوی شیعرو دۆزینەوەی جوانیدا وەك چۆن لای (گۆران) لەنیوەی دووەمی سەدەی بیستدا دەگاتە لوتکە. شاعیرانی ئێمە لەسەرەتای سەدەی بیستدا هەموو وەك ریفۆرمیست کاریانکردووەو ئەرکێکی زۆرو زەوەندو هەمەلایەنەیان داوەبەشانی شیعردا کەئەرکی شیعرنییە، شاعیرانی ئێمە تەنیا لەرێگەی بینینی شتەکانەوە توانیویانە بگەنە وەسفێکی سادە یان بەدەگمەن قوڵی شتەکان ئەویش بەزمانێکی سادەی دوور لەشیعرییەت، جگەلە شاعیرانی کلاسیکمان لەشێوەی (مەحوی) لەکاتێکدا ئەرکی شیعر خوڵقاندنی جۆرێکی ترە لەزمان و لەرِوانین و لەدەربرین و جیهانبینی بۆدنیاو بۆ شتەکان.

(جگەر خوێن)یش یەك لەو شاعیرانەیە کەشیعری بەو ئاراستەیەدا بردووە، کەدیارە ئەمەش رەنگە دیاردەیەکی تایبەت نەبێت بەکوردو بەڵکو رەنگە زۆر نەتەوەی تر لەقۆناغی رزگاری نیشتمانیدا هەمان شێوەی ئێمەبووبن بەڵام هێندە هەیە کەمەسەلەی داگیرکاری بۆکورد زۆر جووداترە لەنەتەوەکانیتر.

(جگەر خوێن) لەسەر دەمێکی زۆر هەستیاردا هاتۆتە دنیاوە، بەتایبەت کەخۆی وەك کوردێك شایەتحاڵی تەواوی ئەو زوڵمو زۆرە بووە کەلەنەتەوەکەی کراوە لەلایەن داگیرکەرانی هاوچەرخەوەو بەبەرچاوی گەورە هێزە تازەکانەوە. ئەمەش کاریگەرییەکی زۆری لەسەر شیعرو دنیابینی (جگەر خوێن) داناوەو وەك حیکایەتخوانێکی راستگۆ وردو درشتی ئەو رووداوانەی وەك شیعری بەرگری بەدیالێکتی کرمانجی ژوورو نوسیوەتەوە. سەردەمی هاتنە دنیای جگەر خوێن سەردەمی خێرای بەشارستانی بوونی نەتەوەکانەو، هاوکات سەردەمی بەدرِندەبوونی زیاتری داگیرکەرانی کوردیشە چونکە داهاتنی تەکنۆلۆژیای نوێی سەربازی زیاتر کۆمەکی داگیرکەرانی کوردی کرد بۆ قرِکردنی کوردو سووتاندنی تەواوی نیشتمانەکەی بەسیاسەتی ئاگرو ئاسن. ئەو شایەتحاڵی کۆمەڵکوژییەکانی دوای دامرکانەوەی شۆرِشەکەی (شێخ سەعیدی پیران)و لەسێدارەدانی شۆرِشگێران و دواتر کۆمەڵکوژییەکانی دۆڵی (زیلان)ی بەچاوی خۆی بینیوە کەبەهۆی سەر هەڵدانەکەی (سەید رەزای دەرسیم)ەوە لەساڵی(1937) رژێمی درِندەی (ئەتاتورك) بەربۆتە گیانی خەڵکی ئەو ناوچەیەو بەهەزارانی لێ گوللەباران کردوون. لای جگەر خوێن ئەم رووداوە دەبێتە شیعر (پشتی شەرێ ئەرارات/ بسەر کورد دە بەلاهات/ زارو زێچ و مێرو ژن/ کەتن ناڤ لەپێ دژمن/ دبێن چل‌وحەفت هەزار/ هەمی رەبەن، تەڤ هەژار/ ئاژوتن گەلیێ زیلان/ هەمی دانەبەر گوللان) ناونیشانی شیعرەکەی درِندەیی دوژمنە(هۆڤیتییا دژمن)ەو تێیدا باسی ئەوە دەکات کەچۆن تورکە کەمالییەکان لەدوای شەرِی ئاراراتەوە هاتوونەتە ناوچەی زیلان و چلو حەوت هەزار ئینسانی کوردیان بردۆتە دۆڵێکەوەو گوللەبارانیان کردوون. لەوە دەدوێ کەچۆن تورکە کەمالییەکان کوردستانیان سوتاندووە

چۆن ناوی شارو گوندو ناوچە کوردییەکانیان گۆرِیوەو درِندانە بەربوونەتە گیانی خەڵکی کوردو دەستیان لەمناڵی ساواش نەپاراستووە(من دی زارۆکەك پەپووك/ پەرێشان و پر بچووك/ ژ ناڤ ئاگر درەڤی/ دڤێ کو زوو دەرکەڤی) ئەمیش چەشنی خانی هاواری یەکبوونی کوردان دەکات و پێیوایە گەر کورد یەك بێت و دوای زانست و وشیاری کەوێت لەژێردەستەیی دەردەچێت و کەس زاتی چەوسانەوەی ناکات(رابن بین یەك، دەستان بدن هەڤ/ ژ بۆمە دڤێت تەنێ هشیاری/ شازدە ملیون کورد گەرناس و مێرخاس/ دانە سەرێ خوە ئەڤ رەشە چاری/ تاکەنگێ دژین پەرچە پەرچە کورد/ ما کی دخوازی ڤی ئیش و کاری/ راستە بن دەستی کارێ قەلسایە/ لسەر خوە راکن وێ ئەم نەچاری)جگەر خوێن حیکایەتخوانی ژان و ئازارەکانی نەتەوەکەیەتی و زیاتر بەتەنگ مەسەلە مێژوویەکانەوەیە، رووداوەکان لەیادەوەری تاکەوە دەکاتە یادەوەرییەکی دەستە جەمعی و بۆ هەتاهەتایی دەیپارێزێ. ئەوەی لای ئەم هەستیپێدەکرێت یەکێتی بابەت و هێڵی درامی شیعرە بەجۆرێك باسی مێژوو دەکات کەرِووداوەکانی وەك رۆژژمێرێك بەدوای یەکدا دێن و بەمەش ئەرکی شیعری قورسکردووەو کردویەتییە لقێك لەمێژوو، چونکە دەبێت ئەوە بزانین کەهەمیشە ئەدیبان ئەو کونج و گۆشانەی مێژووی ئینسان بەسەر دەکەنەوە کەخودی مێژوونوسان بەسەریدا تێدەپەرِن، بەڵام لای جگەرخوێن مێژوو وەکو ئەوەی روویداوە دەنوسرێتەوە، واتا ئەم شاعیرەمان مێژوو لەبۆتەی شیعردا دادەرِێژێت و وەك لاوك و حەیران دەیگەیەنێت بەئێمە.

ئەو بارو دۆخە خراپەی ژیانی کورد وایکردووە شیعری ئێمە یەك پارچە ببێتە حەماسەت و دووربێت لەهەر جوانکارییەکی شاعیرانە وەك لەسەریشەوە ئاماژەمان پێدا جگەر خوێن لەم رووەوە گەورەترین زیانی لێکەوتووەو وەك شاعیرێکی حەماسەت و بەرگری ناسراوەو ئەمەش رەنگدانەوەی خراپی دەبێت لەسەر نەتەوەو (ئەفلاتوون) گوتەنی هەرکۆمەڵگەیەك بەرەو حەماسەت برِوات لەعەقڵانییەت دوور دەکەوێتەوە. ئەمەش لەوەوە هاتووە کەکۆمەڵگە حەماسییەکان پرِن لەعاتیفەو بەبێ پرسیارکردن دوای هەر شتێك دەکەون و دواجار ئەمەش بەرەو هەڵدێریان دەبات.

لای جگەرخوێن فۆرمێکی دیاریکراو نییەو ئەو وەك وێنەکێشی ژیانی خۆی کە نمونەیەکی بچوکی ژیانی پرِ چەرمەسەری نەتەوەکەیەتی فۆرمی شیعری دارِشتووە بۆیە دەبینین پەنای بۆ زۆر فۆرم بردووەو دەتوانین بڵێین هەموو ئەو فۆرمانەش فۆرمی کوردین و لاساییکردنەوەی بێگانەنین. فۆرم لای ئەم شاعیرە تەواوکەری ناوەرۆکەو پەیوەندییەکی هارمۆنی لەنێوان فۆرم لەلایەکو ناوەرۆکیش لەلایەك هەیەو هەر

دووکیان پێکەوە دەتوانن ئەوەی لەئەندێشەی شاعیردایە بیخەینە سەر پەڕەی کاغەز. ئەم لەشیعری خۆیدا هاوشێوەی (بێکەس)ی نەمر لە سێ دەرگای داوە (سیاسەتو کۆمەڵگەو عەشق) لەشیعرە سیاسییەکانیدا جگەلەوەی مێژوو دەگێڕێتەوە، سیاسەتی ئاگرو ئاسنی دوژمنانی کوردیش لەبەرامبەر کورددا باسدەکاتو ئەوەندەی بۆی کرابێت رووی دزێوو دوژمنکارانەی دەوڵەتە سەردەستەکانی کوردی خستۆتە روو بەتایبەت رژێمی کەمالیستی (ئەتاتورک) لەتورکیا، لەهەندێک شیعریشدا گەڕاوەتەوە بۆناو نەتەوەو کۆمەڵگەکەی خۆیی بەر نەشتەری ڕەخنەی داونو سەرۆک هۆزو ئاغاکانو بیری فیوداڵیزمی کوردی بەهۆی دواکەوتوویی کوردو داگیرکردنی زانیوە.

لەشیعرە جڤاکی(کۆمەڵایەتییە)کانیدا هەمان شێوەی بێکەس بەشێوازێکی ساتیرو ئایرۆنییانە قسەلەسەر رووە ناشیرنەکانی کۆمەڵگەکەی دەکاتو دەیەوێ لەو رێگەیەوەو بەو زمانە گاڵتەجارییە زۆر سادەو ساکارە لەخەوی غەفڵەت رایانپەڕێنی، بەزمانێکی کۆمیدی پڕ لە (نۆستالیژیا) لەوە دەدوێ کەکورد هەمیشە نۆکەرو ئەڵقەلەگوێی داگیرکەرانی بووەو ئەنجامیش هیچی پێنەبڕاوەو مایە پووچبووە. (تە ئەز کرم کولێ نەیار/ تە ئەز ژ بانی برمە خوار/ بن دەستێ دژمن مەست و ژار/ دەرمان چیە کار وەر بێژ؟ کورتان ل مل ئەز بوومە کەر/ بارێ نەیاران تم لسەر/ پشتا منە ئاه و کەسەر/ بیرومژی تەڤ بوون قرێژ) (بێکەس) دەڵێ (شەرتە کەریم بارە گوێزم لێنێن خڕەی نەیەت) لای جگەرخوێن حاڵەتەکە تەواو ریالیستییەو شاعیریش ریالیستیانە شتەکان دەبینێو لەوێشەوە حوکمی خۆیدەدات، بەڵام بێکەس پێیوایە میللەت یان کۆمەڵگە وشیاربۆتەوەو هەست بەژانو ئازارەکانی خۆیدەکات بۆیە دواجار بڕیاردەدات ئەمیش وەک عەوامی خەڵک کەربێتو ئەوەندە بەدڵسۆزی بێتو بچێت گوێزەکان خڕەیان نەیەت واتا ئیتر ئەمیش لەئاست خەمی خۆی کەخەمی تەواوی کۆمەڵگەیە خۆی لەگێلی بدات. لێرەشدا جگەرخوێن وەک بێکەس دەبێتە ریفۆرمیستێکی کۆمەڵایەتیو پێیوایە دەتوانێ شەڕی جەهالەتی کۆمەڵگەکەی بکاتو بیانباتە سەر ڕێگەی راستو رووناکییان پێشانبدات، بەڵام ئەمیشو بێکەسیش درەنگ زانیتیان شەڕی دۆنکیشۆتانەیان کردووەو کۆمەڵگە لەوەش چەقیوترە لەلیتەی نەزانیدا کەئەمان هەستی پێدەکەنو دەیانەوێ دەریبێننەوە.

ئەڤین یان لایەنی سۆزداریش لای شاعیر گرنگی خۆی هەیەو، شیعرە ئەویندارییەکانیشی دواجار هەر گەڕانەوەیە بۆ مەسەلەی نیشتمانیو نەتەوەیی، ئەم رەوتەش لەشیعری کوردیدا لەسەرەتای سەدەی بیستدا لەلای (فایەق بێکەسو ئەحمەد موختار جاف) دەردەکەوێتو دواتر لای (هێمن) تەواو چڕ دەبێتەوە بەجۆرێک کەزۆرجار نازانێ ئەوەی شاعیر ئەیدوێنێ رەگەزی مێیە یان نیشتمان. لەگەڵ ئەوەشدا کەجگەر خوێن کاری لەفۆرمی شیعریدا کردووە، هاوکات گەڕاوەتەوە بۆ کلاسیکی کوردیو دواتر بۆ کێشی پەنجەو کێشە خۆماڵییەکانیتر کەلە(توحفەی موزەفەریە)دا (ئۆسکارمان) باسیدەکاتو نمونەی ئەو جۆرە کێشانەی لەفۆلکلۆری کوردیدا دۆزیوەتەوە.

ئیشەڤ ژڤانێ مەیە
بێژن کەچی بلا بێ
لناڤ بەخچە رێ هەیە
کو ئەم ڤەخون شەرابێ
ئەمێ روونن لبانی
ماسە لرۆژ مەدانی
دا کو نەبت خوبانی
شرین و ماهیتابێ

یان:

کو دەڤ بکەن تێ باڵ مەدا، سۆرگول لهاویر شین دبن
لێ ئەز دزانم وێ چکێ،کو ئەبروان وەک شوور دکی
وی خوێنخوارێ تالان کرم، کو دانە بەر پێ جان و دل
لێ ئەڤ ستەم ماکی دکی، وەک کوهرەش و تەیموور دکی

دیارە ئەمەش، ئەم یاریکردنە بەوشەو هونەری شیعر بۆ شارەزایی جگەر خوێن دەگەڕێتەوەو ئەوەش دەردەخات کە ناوبراو زیاتر هەوڵیداوە شیعر لەگەڵ سەردەمەکەدا بەرێتە پێشەوەو لەتازەکردنەوە جێنەمێنێ، شتێکیتر کەدەکرێ لەکۆتایی ئەم نوسینەدا باسی لێوەبکرێت تێکەڵاوبوونو فێربوونی (جگەر خوێن)ە بەدیالێکتی سۆرانیو نوسینی شیعرە بەو دیالێکتە. گەر بگەڕێینەوە بۆ سەرەتای چلەکانو لاپەڕەکانی (گۆڤاری گەلاوێژو هاوار) هەڵدەینەوە چەند شیعرێکی ئەو دەبینین کەبەزاری سۆرانی نوسراوەو لەو شیعرانەشدا کە بۆ (ئەسیری) شاعیری شۆڕشگێڕی ناردووە شارەزایی ئەو زیاتر لەزاری سۆرانیدا دەردەکەوێتو پاڵنەری ئەمەش هەستی نیشتمان پەروەریو گیانی بەرگری بووە کەئەم دوو شاعیرە شۆڕشگێڕەی بەیەک ئاشنا کردووەو هەر لەخۆشەویستی (ئەسیری)شدا بووە کەشاعیر فێری سۆرانی بووەو شیعری پێنوسیوە.

ئەم شاعیرەمان وەک زۆر شاعیری ترمان زۆرداری کردییە شاعیرو لەپێناوی ئازادیو هەر بەئازادیش لەئاوارەییو دەربەدەری لەنیوەی دووەمی هەشتاکانی سەدەی رابردوودا لە(ستۆکۆڵم)ی پایتەختی دیموکراتیترین وڵاتی دنیا (سوێد) گیانی سپاردووە.

# بەنێویەکدا چوونی ئەدەب و ئایدیۆلۆژیاو جوگرافیا لە شیعرەکانی جگەرخوێنی شاعیردا

عەبدولمەنان خلباش

و: هێمن حەمید

دەزگاو ناوەندە ڕۆشنبیریو کۆمەلأیەتییە کوردییەکان لە چەندین شوێنی جیاجیادا، بەبۆنەی یادی سەد ساڵەی لە دایکبوونی شاعیری کورد جگەرخوێن(شێخموس حسۆ)، ئاهەنگیان سازدا.

ئەم شاعیرە دیارترین و ناودارترین شاعیرە لە سەدەی بیستەمدا کە پەیوەستێکی گەورەی بەشوێن و کولتورو زمانەوە هەیە، بەئەندازەیەك هەندێ کەس بۆ (زەردەشتی سەدەی بیستەم) ناویان بردووە، چونکە توانایەکی زۆری لە خستنە ڕووی چەندین پرسیار و بیری تازەدا هەبووە، بەتایبەتی لە نووسین و شیعرەکانیدا کە لەو بارودۆخە سەخت و دژوارەی ئەو سەردەمەدا بە هەموولایەکدا بلأوبووەوە.

سەرباری ئاڵۆزیی بارودۆخی سەردەمی ژیانی جگەرخوێن، بەلأم ئەو بوو بەهێماو ڕەگەزێکی گرنگ لە ڕۆشنبیریی کوردیدا. دوای تێپەڕبوونی دوو دەیە بەسەر کۆچی دواییدا، تائەمڕۆش کاریگەرییەکی بەرچاوی هەیە و هەڵوێستەکانی لە دنیای ڕۆشنبیری و ئەدەبدا بەرز دەنرخێنرێن، مۆرکی ئەدەبی جگەرخوێن بەدرێژایی سەدەی بیستەم بەسەر ئەدەبی کوردیدا زاڵبوو.

جگەرخوێن لە ساڵی1903دا لە هساری سەربەویلایەتی ماردین لەدایکبووە، منداڵیی لەنێو کەشو هەوای دوکەڵ و باروت بەسەربردوو وە بەتایبەتی لە پاش دامرکاندنی ئاگری شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی کورد، لەو سەروبەندەدا گەل و نەتەوەکانی ژێر دەسەلأتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی هەوڵی بەدەستهێنانی ڕزگارییان دەدا، بەلأم سەڵتەنەتی عوسمانی دەستی کردبە هەڵمەتێکی فراوانی گرتن و کوشتن و لەنێوبردن و دوورخستنەوەو سیاسەتی بەتورککردنی گەلانی تر؛ ئەمە سیمای هەرە دیاری ئەو قۆناغەبوو.

جگەرخوێن هێشتا تەمەنی نەگەیشتبووە پانزە ساڵی کە باوکی کۆچی دوایی کرد، پاش ساڵێك دایکیشی کۆچی دوایی کرد، ناچاربوو لەلای خوشکە گەورەکەیدا بژیت. لەوکاتەدا جگەلە شوانکاری هیچ کاروپیشەیەکی تری لە بەردەمدا نەبوو، بەلأم بە هۆی ئەو کارەوە چاوی بەشوێن و ناوچە هەرە دوورەکان کرایەوە، بۆ نموونە دەشتاییەکانی موش و سرهەد و ناوچەی سۆران و ڕەواندز و گەلێ شوێنی تر، بەلأم هەر زوو وازی لە شوانکاری هێناو ڕوویکردە یەکێك لەو قوتابخانە ئاینییانەی لەو سەردەمەدا باوبوون دوای ئەوەی بۆ ماوەی دەساڵ سەرقاڵی خوێندنی ئایین و ئەدەب و زمان و مێژووبوو،، توانای ئەوەی هەبوو وەك پیشەی پیاوی ئایین لە ناوچەو گوندە دوورەکان و لە سێنتەری شارەگەورەکاندا خەڵکی فێر بکات. جگەرخوێن بایەخی بەئەدەبی کلاسیکی کوردی دەدا و بەرهەمی شاعیرانی وەکو بابا تاهیری هەمەدانی و مەلای جزیری و ئەحمەدی خانی و پرتو هەکاری و نالی و زۆر ناوی دیکەی دەخوێندەوە، خوێندنەوەی شیعری ئەو شاعیرە نەمرانە بووە مایەی بارگای بونی هەست و خەیاڵی جگەرخوێن بە هەست و خەیاڵێکی شیعرییانە، بەتایبە تی پاش ئەوەی بیرو یادەوەریی تری بوو لە وێنەو بیرەوەری و توانای ئەدەبی کە خەمی نووسین و گوزارشتکردنی کێشەکانی لەلادا گەلاڵەبوو.

ڕووداو و ململانێ فیکری و ئایدیۆلۆژیەکانی ئەو سەردەمە جگەرخوێنیان بەرەو خوێندنەوەی ئەوژم و ئایدیۆلۆژیا باوەکانی ئەو کاتە برد، لەوانە ئایدیۆلۆژیای مارکسیزم، بەتایبەتی لە دوای تێکەڵبونی هێماو ڕەگەزە فیوداڵی و ئاینیەکان لەگەڵ کەمالیزمدا- واتە کەمال ئەتاتورك- کەبووە هۆی لاوازکردنی بونیادی کۆمەلأیەتی و کولتوری و سیاسی لەسەر حیسابی خواست و هیواکانی گەلی کوردو گەلانی تری ناوچەکە. ئەمە دوای ئەوەی پەیمانی(سیڤەر) کە لە ساڵی1920دا مۆرکرا هەڵوەشێنرایەوەو لەبری ئەوە پەیمانی(لۆزان) لە ساڵی1923دا مۆرکراو لەوێدا خواست و هیوای هەموو گەلانی غەیرە تورکی فەرامۆشکرد.

دوای ئەوەی شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی گەلانیان بە ئاگرو ئاسن خامۆش کرد، جگەرخوێن لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری کوردی تردا وڵاتیان جێهێشت و ڕوویانکردە دوورگەی سوریا و لە(عامودا) گیرسانەوە. ئەگەرچی جگەرخوێن لە شۆڕشی شێخ سەعیدی پیراندا بەشداریی کردووە، بەلأم دواتر بەلای شیعرو ڕۆشنبیریدا ڕۆیشتووە تا لە ڕێگەی ئەدەبەوە گوزارشت لە دۆخەکە بکات و ڕەخنەیەکی توند ئاڕاستەی هێما ئایینی و فیوداڵیتیەکان بکات وەك تۆڵەسەندنەوەیەك لەکارە دزێوەکانیان.

لە پێشەکیی یەکەم دیوانی جگەرخوێندا کە لەسەرەتای سییەکاندا بەناونیشانی (پشکۆ و پیت) لەدیمەشق چاپکرا، ڕۆژنامەنوس و زمانزانی پێشکەوتنخواز جەلادەت بەدرخان هەندێ لەو شتانە

دەگێڕێتەوە کە لەوکاتەدا لەنێوان جگەرخوێن و هەندێ لە پیاوانی فیودالی و ئاینیدا هەبوو بەتایبەتی(حاجو ئاغا)ی دەرەبەگ، جگەرخوێن پێیوتووە:"تۆ ئەتوانیت بەشمشێرە تیژەکەت لەناومانبەریت، بەڵام تەنها دین و دیانەت دووربخەرەوە".

ئەو هەڵوێست و رەخنە توندانەی جگەرخوێن لە رەگە زو هێماکانی کۆنەپەرستی و فیودالی، بنکەیەکی جەماوەریی فراوانی بۆ دروستکرد، ئەو بارودۆخە جگەرخوێنی بەرەو پەیوەندیکردن بە حیزبی(خۆیبون) برد کە لە ساڵی1927 لە لوبنان دامەزرا، حیزبی خۆیبون لەلایەن ئەم کەسایەتییە کوردییانەوە دامەزراوە: (جەنەراڵ ئیحسان نوری وبلەچ شێرکۆ و جەلادەت بەدرخان و کامەران بەدرخان و قەدری جان و نورەدین زازا و حەسەن هوشیار و گریگۆر مادویان و زۆری تریش) ئەم رێکخراوە چەندین چالاکیی رۆشنبیریی ئەنجام داوەو بزوتنەوەیەکی فیکری و رۆشنبیریی بەرفراوانی فەراهەم کرد، چەندین گۆڤار و رۆژنامەیان دەرکرد، لەوانە: گۆڤاری(هاوار) لە دیمەشق، رۆژنامەی(رۆژا نوێ) لەبەیروت، بە هەردوو زمانی کوردی و فەرەنسی بابەتەکانیان بلاودەکردەوە، ئەمە رێگەی بۆ جگەرخوێن کردەوە دەست بە نووسین و بلاوکردنەوە بکات، لە ساڵی 1931دا(یانەی رۆشنبیری لە عامودا)ی کردەوە و ژمارەیەک لەناوە دیارەکانی ئەدەبی و رۆشنبیریی کوردی لە دەوری خۆی کۆکردەوە وەکو نایف حەسۆ و مەلا بالۆ و رەشید کورد وهی تر.

جگەرخوێن توانایەکی وەهای پەیداکرد کە بتوانێ هەنگاوێکی ناوازە لە پێشخستنی ئەدەبی کوردیدا بخوڵقێنێ بەوەی کە ئەدەب و شیعرو هونەری هێنایە ناو ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فیکرییەوە، واتە ئەدەب و رۆشنبیریی لەچینەکانی خوارەوەی کۆمەڵگا نزیک خستەوەو رەهەندێکی مرۆڤانەی پێبەخشی. شیعری نەک تەنها بۆ خواستەکانی گەلی کوردنووسی، بەڵکو بۆ گەلانی تری ئازادیخوازیش نووسی بۆ نموونە فەلەستین و ڤێتنام و جەزائیر و کوباو ئەنگۆلا و رەش پێستە ئەمریکیەکان، لەکۆتایی ساڵانی چلەکانی سەدەی بیستەمدا جگەرخوێن یەکێک بوو لە دامەزرێنەرانی بزوتنەوەیەکی سیاسی کاریگەر لە سوریا، لە کۆتایی پەنجاکانیشدا دەچێتە بەغدا و لەوێ لە کۆلیژی ئادابی زانکۆی بەغدا-بەشی کوردی- وەکو مامۆستایەک دەرس دەڵێتەوە، بەڵام زۆری لێنامێنێتەوە و لە سەرەتای شەستەکاندا دەگەرێتەوە بۆ دیمەشق و لەوێ رووبەرووی بریارێک دەبێتەوە کە بەپێی ئەو بریارە هەموو حزب و کۆمەڵەکان دادەخرێن، کاتێکیش جگەرخوێن ئەو بریارە رەت دەکاتەوە، دەسەلاتدارانی سوریا دەیگرن و دەیخەنە زیندانەوە لەتەک عوسمان سەبری و رەشید حەمۆ و نورەدین زازا و عەلی خواجە کە ئەمەی دواییان چاپخانەکەی بەرێوەدەبردو پاشان لە ژێر ئەشکەنجەدا گیانی سپارد.

سەرباری لاوازیی جوڵانەوەی سیاسی و رۆشنبیری، بەڵام جگەرخوێن درێژەی بە نووسین و تێکۆشان داوە، گۆڤارێکی بەناونیشانی(گولستان) دەرکرد کە بەچەندین ناوی جیاجیا بابەتی لەبواری ئەدەب و شیعرو وەرگێران و فۆلکلۆر و کەلەپوری میللیدا بلاوکردەوە. لە سەرەتای حەفتاکانیشدا چووە بەیروت و لەوێ گرنگترین دیوانە شیعرییەکانی خۆی بەچاپ گەیاند بەناونیشانی (من کێم؟)، پاشان داستانی(سالار و میدیا)ی چاپکرد. لەکاتی شەری لوبنانیشدا جگەرخوێن بەرەو سوید رۆیشت تالەوێدا ژیان بەسەربەرێت، بێگومان لەوڵاتی سویدیشدا چالاکی بەرفراوانی ئەنجامداو ئێستگەیەکی رادێویی بە زمانی کوردی دامەزراند، هەروەها دەستیکرد بە دەرکردنی رۆژنامەی(رۆژا نوێ) کە لەکۆتایی سییەکانەوە تاناوەراستی چلەکان جەلادەت بەدرخان لە بەیروت دەریکرد.

جگەرخوێن، لە سوید هەشت کۆمەڵە شیعری خۆی بەچاپ گەیاند، لەوانە(هێڤی) و(رۆناک) و(زندا ئاڤێستا) جگە لە چواربەرگی کتێبێکی مێژوویی و بیۆگرافیای خۆی لە سێ بەرگدا و هەروەها کتێبێکی قەبە و گەورە کە بابەتی فۆلکلۆری تیادا کۆکردبووەوە.

لەپاریس لەگەڵ پرۆفیسۆر کەندال نزان بەشداریی لە دامەزراندنی(ئەنیستیتۆی کورد لە پاریس) کردووە کە جگە لەمان هەریەک لە یلماز گۆنای و همرش رەشۆ و مەحمود باکسی و هیتر بەشداربوون لە دامەزراندنی ئەو ئەنیستیتۆیەدا. لەرۆژی22ی تشرینی یەکەمی ساڵی1984دا کۆچی دواییکرد، بەرلە مردنی، کەسوکاری ئاگادارکردبوو کە لە باخچەی ماڵەکەی خۆیدا لە شاری (قامیشلی) بنێژرێت. بەفەرمانی سەرۆکی کۆچکردووی سوریە حافز ئەسەد، لاشەی جگەرخوێن بە فرۆکەیەکی تایبەتی گواسترایەوە بۆ قامیشلی، نزیکەی نیوملێون کەس بەدوای تەرمەکەیەوەبوون.

چەندین گۆرانی بێژی ناوداری کورد هەندێ لە شیعرەکانی جگەرخوێنیان کردووە بە سروودو گۆرانی، لەوانە شڤان پەروەر و جوان حاجۆ، شیعرەکانیشی بۆ چەندین زمانی جیهانی وەرگێردراون بۆ نموونە رۆجی لیسکۆی فەرە نسی هەندێ لە شیعرەکانی کردوون بە فەرەنسی و ڤلادیمێر رودرنیکۆ کردوونی بە رووسی. دواجار بەم وتەیەی پرۆفیسۆر قەناتی کوردۆ کۆتایی بە نوسینەکەمان ئەهێنین کە دەڵێت:"مافی ئەوەمان هەیە بەختەوەربین چونکە شاعیرێکی مەزن و پێشکەوتنخوازو دیموکراسی لە کوردستان هاتۆتە دەرێ".

# جگەرخوێن • لە نەوەدەیسالی نوێی کوردیدا!

کەریم چولی

مێژووی ئەدەبیاتی کوردی مێژوویەکی پرشنگدارە، ئەگەرچی دەتوانین شانازی بە گشت لایەنەکانی مێژوومانەوە بکەین، بەڵام بێگومان ئەدەبیاتی کورد لە جۆشدانی هەستی نەتەوایەتیو دیاریکردنی هەڵەو جوانییەکانی سەردەمانی رابردوو، پیشاندانی رێگای راستو دروست بۆ داهاتوو، بە سەر لاپەڕەکانی مێژووی ئەدەبی کوردییەوە دیارە.

یەکێك لە کەڵە پیاوانی مێژووی ئەدەبیاتی کورد کە خزمەتێکی زۆری بە هەستی نەتەوایەتیو زمانو کلتوری گەلەکەی کردووە، هۆزانڤانو زمانزانی کورد، مامۆستا "جگەر خوێن"ی نەمرە.

جگەر خوێن.. لە سەردەمێکدا لەدایك دەبێتو چاو بە خاكو نیشتمانەکەیدا هەڵدەهێنێت کە دەمێك بوو وڵاتەکەی لە نێوان هەردوو ئیمپراتۆریەتی سەفەویو ئوسمانیدا کرابوو بە دوو پارچەوە، لەو کاتەداو لە ساڵی "1903" لە گوندی "حەساری" کە ئێستا سەر بە رۆژئاوای کوردستانە، لە نێو بنەماڵەیەکی هەژارو نەداری گوندنشین دا لەدایك دەبێتو ناوی لێدەنرێ "شێخ موس".

سەرەتای منداڵیو دەستپێکردنی ژیانی "جگەر خوێن" وەکو زۆربەی منداڵانی ئەو سەردەمەی کوردستان بە کوێرەوەرییو ناخۆشیی دەستپێدەکات، هێشتا لە تەمەنی منداڵیدا دەبێت کە جەنگی جیهانیی دەستی پێکردو ئیمپراتۆریەتی ئوسمانی کە داگیرکەری بەشی هەرە گەورەی کوردستان بوو، بووە بەشێك لە جەنگەکەو ئیتر باری ژیانو گوزەرانی خەڵکی کوردستانیش روو بە رووی سەختیەکی گران بووەوە، لە هەمان کاتدا شۆڕشو راپەڕینەکانی کوردیش بۆ سەربەخۆییو پێکهێنانی دەوڵەتی کوردی کاریگەرییەکی زۆریان لە "جگەر خوێن "کردو هەر لە سەرەتای منداڵییەوە هەستی بە چەوساندنەوەی گەلەکەی کرد.

(جگەرخوێن) سەبارەت بە ژیانی خۆی دەڵێت: "سێ جار ماڵمان وێرانو تاڵان کراوە لە ساڵی "1918"دا باوکم کۆچی دوایی کردو پاش ماوەیەکی کەم دایکیشم کۆچی دوایی کرد". لە دوای مردنی دایكو باوکی ماوەیەك لە ماڵی "مەلا خەلیل"ی برای دەمێنێتەوەو پاشان دەچێتە ماڵی خوشکە گەورەکەی لە شارۆچکەی "ئامودێ" بە بێکەسیو بە ناچاریی لە تەمەنی "15" ساڵیدا "جگەر خوێن" روو لە مزگەوتەکانی ناوچەکە دەکاتو دەبێتە فەقێو دەست بەخوێندنی قورئانو کتێبە ئاینییەکانی تر دەکات.

جگەرخوێن، خۆی لەو بارەیەوە دەڵێ: "هەندێك برادەری فەقێ-م هەبوون ژیانیان زۆر بە باشی دەچووەسەر و خەڵکی رێزیان لێدەگرتنو خواردنی چاکیان دەستدەکەوت، داوایان لە منیش کرد دەست بە فەقێیەتیو خوێندن بکەم، بۆیە لە سەر داوای ئەوان رووم لە مزگەوتەکانو فەقێیەتی کردو توانیم سەرکەوتوو بم".

بەم شێوەیە (جگەرخوێن) دەستدەداتە خوێندن و هەر لە ناو حوجرەی مزگەوتەکاندا جگە لە کتێبە ئاینییەکان ئاشنای هۆزانەکانی (ئەحمەدی خانی)و (مەلای جزیری)و (فەقێ تەیران)و (حەریری)و (پەرتوی هەکاری)و چەندین هۆزانڤانی تر دەبێت و دەست بە خوێندنەوەیان دەکات، بە تایبەتی مەم و زین-ی ئەحمەدی خانی و شیعرەکانی (مەلای جزیری) کاریگەریی زۆری لە سەر دادەنێن، بۆیە لە بری بەردەوامبوونی لەسەر خوێندنەوەی کتێبی ئایینیو کاری مەلایەتیو وتاربێژیی مزگەوتەکان، دەستدەداتە خوێندنەوەی ئەدەبیاتو زمانی کوردیو بە سەلیقەو لێهاتوویی خۆی دەبێتە بلیمەتێکی ئەم بوارەو دەست بە نووسینی هۆزانو چیرۆكو مێژوو دەکات، ئەگەرچی سەرەتا بۆ گوزەرانی ژیانی رۆژانەی "جگەر خوێن" ماوەی (8) ساڵ لە گوندەکانی ناوچەی جزیرەو ماردین دەبێتە مەلاو لە دوای دابەشکردنی دووەمی کوردستان گوندەکەی "جگەر خوێن " بەر کوردستانی سوریا دەکەوێت، کە سەر بە شارۆچکەی "ئامودێ" بوو هەر لەوێ لە ساڵی 1927 جگەر خوێن ژیانی هاوسەری پێکدەهێنێ.

(جگەرخوێن) لە هۆنینەوەی هۆزاندا رێچکەی پێچەوانەی پەسندی بەژنو باڵا ئەگریجەی خاو، دەگرێتەبەرو بەوپەڕی هەستی نەتەوایەتیو نیشتیمانپەروەرییەوە ئەسپی خۆی تاودەدات، بۆیە دێت و بە (کیمە ئەز) دەستپێدەکاتو پڕ بە دڵ هاواردەکات رەچەڵەکی کورد ئارییە. ئەو پرسیارە لە خۆی دەکات ئێمەی کورد بۆچی وڵاتێکی سەربەخۆمان نەبێت؟ چونکە (جگەرخوێن) لە هیچ روویەکەوە گەلەکەی خۆی لە گشت روویەکەوە لەگەلانی تر بە کەمتر نەزانیوە. روو لە رۆڵەکانی گەلەکەی دەکاتو دەڵێ: (هەرنەپێش دەور دەوریا مەیە) واتە بۆ راپەڕین و بەرخۆدان بانگدێرییان دەکات و دەڵێ: بە فیداکاری و قوربانی ئێمە نەبێت هەرگیز ئەم وڵاتە رزگاری نابێت.

جگەرخوێن (10) دیوانی شیعری نووسیوەو بەشی هەرەزۆری شیعرەکانی نیشتیمان پەروەریین‌و بەشەکەی تریشی باسی سروشت و جوانی کوردستان دەکەن.

جگەرخوێن.. توانیویەتی بە هەردوو دیالێکتی کرمانجی (سەروو)و (خواروو) شیعر بنووسێت، ئەگەرچی بەداخەوە تا ئێستا لێکۆڵینەوەی پێویست لەم بوارەدا نەکراوە، کە دەکرێت بڵێین بە ڕاستی جگەرخوێن شارەزای زمانی کوردی بووە، نەك شارەزای دیالێکتی ناوچەیەکی دیاریکراو، بۆیە توانیویەتی بە هەردوو شێوەزاری کرمانجی شیعر بنووسێت، جگە لە شیعر (جگەرخوێن) چیرۆك و بەرهەمێکی بەپێزی بە ناوی (مێژووی کورد) لە سەر مێژووی کوردستان و شۆڕشەکانی کورد نووسیوە، هەروەها دەستوری زمانی کوردی نووسیوە کە پیتە لاتینییەکانی بەکارهێناوەو ئەم بەرهەمەش یەکێکە لە بەرهەمە نایابەکانی جگەرخوێن.

سەرەتای دەستپێکردنی شۆڕشی ئەیلول، جگەر خوێن بەشداری لە شۆڕش دا کردووە، ئەندامێکی کاراو لێهاتووی (کۆڕی زانیاریی کورد) بووەو ماوەیەك لە زانکۆی بەغدا دەبێتە مامۆستای زمانی کوردی‌و چەندین مامۆستا لە سەر دەستی ئەو فێری زمانی کوردی بوون.

لە دوای شکستی ساڵی 1975 "جگەر خوێن" دەگەڕێتەوە سەر زێدی باب‌و باپیرانی لە "ئامودێ" بەڵام دەسەڵاتدارانی سوریا فشاری زۆر دەخەنە سەری‌و ناچار دەبێ ساڵی 1977 بچێتە لوبنان‌و پاشان لە ساڵی 1979 دەچێتە وڵاتی "سوید"و لە شاری "ستوکهوڵم" نیشتەجێ دەبێت تاوەکو لە ڕۆژی 1984/10/22 هەر لە پایتەختی وڵاتی "سوید" کۆچی دوایی دەکات‌و لە سەر وەسیەتی خۆی تەرمە پیرۆزەکەی دەگەڕێننەوە کوردستانی سوریاو لە ناو حەوشەی ماڵەکەی خۆیدا بە خاك دەسپێردرێت.

# روناكبيرێ كوردپەروەر جگەرخوێن

## ژین و ژیار

شەوكەت تاهر سندی

نڤێسین و لێكولێن ل سەر رۆناكبیرەك مینا سەیدا جگەرخوین بابەتەك مەزنە و بەرفرەهە، رێكەك سەخت و درێژە، كاروانیەك خودان سەبر و ئارام و بێهن فرەهـ بو دڤێت، بارەك ئێكجار گرانە دوو ملێن پیلای بو دڤێن، خوەندنگەهەكە شاگردەك ژیر و هشیار ژێرا دڤێت، چیایەك بلندە ئلهویەك نێچیرڤان بو دڤێت بگەهت كومتا وی، دەریایەك مەزنە، مەلەڤانێن دەریا دڤێت هەبن تاكو بشێن بگەهن دور و ئەلماسێن وێ، شورەشەكە ئایدیۆلۆجیا وێ ژ هزرا نەتەوەیا خانی یە، پەیڤێن وێ سەركێشێ رەوشەنبیریا نیڤا دووێ ژ چەرخێ بیستێ بوون.

سوختەك مینا من ل دەستپێكا ئەلف و بێ یا كوردی، زەحمەتە بشێت ل بەرامبەری ڤی شاسواری راوەستت و ل دیوانا وی بپەیڤیت.

## ژین و ژیار:

ناڤت سەیدایێ جەگەرخوین شێخ مووسە، كورێ حەسەن كورێ محەمەد كورێ عەلی. ناڤێ دەیكا وی فاتمایە، ل سالا1903ز ل گوندێ حەساری ژ دایك بوویە و چاڤ گەشكرنە ل ڤێ جیهانێ مینا سەیدا دبێژت:

سالا هزار و نەهسەد و سێ ئەز هاتم دونیاێ
بناڤێ سلطان شێخ مووس ئەز چێبوومە ژ داێ

هێشتا شێخ مووس زارۆك بوو، ل پێشیێ بابێ وی ژڤێ جیهانا خاپینوك بەر ب بەهشتا پان و درێژ رەبەندێ خوە ئاژوتی یە. پاشی سالەكێ دەیكا وی یاخودێ ناس مێهڤان داری ل بابێ وی كریە و گەهشتی یە رەبەندێ وی.

شێخ مووس ل ڤێ جیهانێ سێوی و بەلنگاز وبێ خوەی و خودان مایە مینا دبێژت:

دیا من ئا بەلنگاز پێنجی سالی دلۆڤان
سالەك پشتی باڤێ من ئەو ژی ل وی بوو مێهڤان

شێخ مووس ژ دەیك و بابێن خوە خوهەك بناڤێ ئاسیا و برایەك بناڤێ خەلیل هەبوون. پشتی شێخ مووس مایە سێوی ژ نەچاری دچیت جەم برایێ خوە مەلا خلیل، لێ ژبەر دەست نەخوەشی و زۆرداریا ژن برا خوە نەشیایە ل جەم برایێ خوە دوم بكە. مینا دبێژت:

برایێ من ئێ نیڤ مەلا ژ عالەما رۆحانی
راست و درست چ بێژم ئەو تشتەكی نزانی

...

وی پیرەكا خوە ئانی بێ وژدان و بێ مەژی
ب گوتنێن خوە ئێن چورس، ئەو من بێ دەرد دكوژی

لەوا شێخ مووس نەچار دبە دچیت جەم خوها خوە ئاسیا خوها وی ئەو شاندیە جەم پەز، بوویە شڤان مینا سەیدا دبێژت:

خوەشكا من ئا خوەندەوار بێ ئینساف و بێ وژدان
ئەز رەڤیام هاتم جەم، وێ ژی ئەز كرمە شڤان

چ ل جەم برایێ خوە یان ل جەم خویشكا خوە، شێخ مووس عەزابەك مەزن دبێنە كەتیە ژیانەك سەخت و دژوار زارۆكی و خورتیا خوە هەمی ب هەژاری دەربەدەری، شڤانی بوراندیە، مینا سەیدا دبێژت:

گەهـ ل ڤر و گەهـ ل وێ من ئەزابەك مەزن خوار
یا الله و یا خودێ پاشێ بوومە خوەندەوار

سەیدایێ كوردپەروەر رێزدار جەلادەت بەدرخان دبێژی: "لێ شێخ مووس د كوراهیا دلێ وی دە ئاگرەك مووقەدەس ڤێدكەت ڤیما خوە ب ڤێ ژینێ نەد ئانی، مووقەدەس ڤێدكەت ڤیما خوە ب ڤێ ژینێ نەد ئانی، ژ نك خوها خوەژێ ب شاش درەڤی و گوند گوند ل مەدەرسا و خوەندنگەها دگەریا گەلەك نەكەتن ناڤێ ئەو شێخ مووسێ سێوی و شڤان بو فەقەهـ و شێخ مووس چاڤێ خوە ل دنیا زانستی ڤەكر".

-مینا سەیدا دبێژت:

ژینا من یا كەڤنارە ئێدی هاتە گوهارتن
تەڤ خوەش و زانە بوون حەفت هەشت سالە هن ب هن

شێخ مووس د خوەندنا خوەدا، فەقەهەك ژیر و سەركەتی بوو، هوشمەند و روناكبیر بوویە، خودان مێشكەك زانستی بوو لەوا سەیدایێن وی ژێ دمانە حێبەتی ب دەهـ سالان خواندنا خوە هەوكریە، خواندنا خوە یا دوایی ل جەم سەیدا عبیدالله ڤەتاند، ژ بەركو شێخی وی ل وێ ناڤێ دەچو رەحمەتێ ئیجازا خوە ل نك برایێ وی مەلا فتح الله ستاند.

شێخ مووس مینا فەقەهێن دەمێ خوە ل دویڤ خواندن و زانینێ گوند ب گوند گەرایە گەلەك نەخوەش و زەحمەت خواریە، ل كوردستانا باكۆر و باشۆر تەڤ گەرایە و هاتیە عیراقێ و ئیرانێ مینا دبێژت:

پاشی چوومە عیراقێ ژ وێ ئەز چوومە
ئیرانێ هەچی كەسێ ب دیما ژمن دمانە حەیران

پشتی سەیدا ناسناما خوە یا خواندنێ ب سەر بلندی وەرگرتی ل سالا1927ز دا نیڤا دینێ خوە ژ حەسارێ ژ خوەرا دئینە.. مینا دبێژت:

من ئیجازا خوە ستاند ب سەربەستی و
مێرانی ژ نوو كەچا خالێ خوە ژ حەسارا خوە

ئانی ژبۆ ژین و ژیارا ژیانێ شێخ مووس ژ نەچاری دبە مەلا ل گوندێ حاسدا جلێن مەلا ل بەرخوە دكە، مینا دبێژت:

بووم مەلایێ حاسدا زۆر جبە پۆش و سەر
ب شاش

ژنوو ريا راست خوەش بوو سەر ژور و رێك و كاش

هەر ل ژيێ 21 سالى دە ئاگرێ كوردينيێ دكەڤە ناڤا جەرگ و جانێ سەيدا، ئەڤينا وەلات دكەڤە ناڤا خوينا وى خاسمە پشتى شورەشا شێخ سعيد كو سەيدا گەلەك پێ داخبار بووى مينا سەيدا دبێژت:

من دەست ب كوردیێ كر، پەيداكرم چەند مريد

ب خوەشخان و رەش بەلەك خاسما پشتى شێخ سعيد

ل ژيێ 24 سالى دە دەست ب ڤەهاندنا شعرا دكە، دبە رستەڤان، ناسناڤێ خوە د شعرێ دەدات ئانى جەگەرخوين چاخێ ئاگرێ كوردينيێ و ڤينا وەلات و دلداريا كوردستان د مێشكێ سەيدادا دكەلى و تيرێن كوردينيێ دلێ سەيدا يێ نازك بريندار دكرن پێش شورەشا شێخ سعيد ب چوار سالان مينا سەيدا دبێژت:

بەرى سالا رەحمەتى ب چار سالا دلبرين دشعرێ دە ناڤێ خوە من داتانى جەگەرخوين ل دەستپێكا سالێن 1930دا شێخ مووس دنێرە كو ئەڤ كەسێن بناڤ شێخ و مەلا دناڤ كوردا دا دورن ژ گوتنا خودێ و پێغەمبەرى(س) ئەو رێ و رێچكێن ئەو ل سەر دچن دورن ژ رەوشا ئوّل پەروەريا راست، ژبەر رەفتارێن وان يێن كرێت دناڤ كۆمەلێدا. سەيدا نەچار دبە جبە و شاشكێن خوە دادنت. بتوندى و دژوارى دژى كارێن وان يێن بەد و خراب رادوەستێت.

ديسا ب عەقلەك ڤەكرى و باوەرەك پيلاييى دبە دوژمنێ بەگ و ئاغايێن كوردا.

بێ ترس و شەرم و ڤەدى هێرش دبرن سەر وان، پاشێ سەيدا و چەند هەڤالێن خوە ژ ئاخا جزيرێ دوو گوند بۆ خوە ئاڤاكرن، دوور ژ ستەما بەگ و ئاغا، ناڤێ يەكێ كرن چێلەك، ناڤێ گوندێ دى كرن جەهەنەم، چكو ئەگەر مرۆڤ ل سەر ئاخا خوە ئازاد نەبە ژيانا مرۆڤ دبە دۆزەخ مينا سەيدا دبێژت:

من ژ ئاخا جزيرێ دوو گوند گرتن كول و غەم

ناڤێ يەكێ چێلەك بوو، ئێدى مەكر جەهەنەم

پاشێ ژ بەخت رەشيا وان، دوو بەندى و بێ تفاقى دكەڤە ناڤ خەلكێ گوند ژوێ سەيدا نەچار دبە دگەرت گوندێ ئامۆدێ.

ل سالا1933-1935 بسپورێ زمان و چاندا كوردى خەباتكەرێ بێ بەڤل سەيدا جەلادەت بەدرخان، ل شامێ كوڤارا هاوار دەرخست، سەيدايێ جەگەرخوێن بلبلێ ئێكێ بوو ئاواز و پەيڤ ژێرا كرين ديارى، ب دلشادى و بەختەوەرى پيرۆزيا كوڤارا هاوار و خودانێ وێ كريە داخواز ژ هەمى كوردا كريە كو ئەو پشتەڤان بن بۆ دەرچوّنا هاوارێ مينا سەيدا دبێژت:

هەزار جارى پيرۆز بتن ئەڤ هەوار

گەلەك خۆب و رندە وەكى گولزار

. . .

گولستانێ زارێ مەيە پر جوان

پەسنديدە كو من بەرێ وێ دخوار

ژبەر بسپوريا سەيدا د زمانێ ماكێدا، پايە بلنديا وى دهۆزانێ دە و دلسۆزيا وى بۆ چاندا كوردى سەيدا جەگەرخوين دبە ئێك ژ ئەندامێن كوڤارا هاوار و نڤيسەرەك بەردەوام مينا سەيدا دبێژت:

جەلادەت بەگ ب ناڤە، من ب شاهى

ڤەبوول كەردم، جەگەرخوين بوويە ئەندام

ل سالا1937ز(ناديا جوان كورد) ساز دكە دگەل چەند هەڤالێن مينا خوە دل شەوات كورد پەروەر لێ پشتى ماوەك كێم ئەڤ ناديە هاتەگرتن، ديسا ل سالا1937 ل ناحيا ئامۆدێ جەگەرخوين ژيۆ خۆرت و كەچێن كورد كورسا خواندن وز نڤێسينا زمانێ كوردى ڤەدكە.

ل سالا1942 جەگەرخوين دكەڤە ناڤ رێزێن كۆمەلا خويبوون لێ ڤيما وى ب وانژى نائێ. ل سالا1945 جەگەرخوين بۆ يەكەمين جار زمان و ئەدەب و كتێبخانا كوردى دەولەمدند دكەت ب چاپكرنا ديوانا يەكەم لە شامێ ب هاريكاريا كتێبخانا هاوار.

ل سالا1947 پرتوكا خوە(جيم و گولپەرى) چيرۆك چاپ كريە.

ل سالا1949 سەيدا دبە هەڤالێ پارتا كومانست، ژبەرڤێ رێكخستنێ توشى گرتن و لێدانەك زۆرمەزن دبە تا سالا1957 مايە دگەل ڤێ رێكخستنێ، ل ناڤبەينا سالێن رێكخستنا وى دگەل پارتا كومانست سەيدايێ جەگەرخوێن ديوانا خوەيا دوێ(سەورا ئازادى) ل سالا 1954 چاپكريە لەوا ئەڤ ديوانە يا پرە ژ هزروبيرێن كومانست..!

ل سالا1958 سەيدا جەگەرخوين ژ نوو ريا راست ل بەراهيا خوە دەبينت و دگەهت راستيێ ژ نوو بريارا خوە يا راست ددەت دبە هەڤالێن پارتا ديموكرات كورد ل سوريێ.

پشتى زڤرينا سەروەرێ كورد بارزانيێ نەمر بۆ وەلاتى ژ ئێكەتيا سوڤێت جاردى هيڤى و نومێد ل جەم زانا و رەوشەنبير و پ.م نويژەن بوونەڤە وەلات بۆ هێلينا كورد پەروەران، سەيدا جەگەرخوين مينا هەر كوردەك دلسۆز و دلبرين ژبۆ كوردايەتى ئەوژى دهێتە عيراقێ ل پێشى سەيدا بێت وەلاتى، ناڤ و دەنگێن وى ل كوردستانێ بەلاڤ ببو، خاسمە شعرێن وى يێن ديوانا يەكەم يێن نيشتمانى ببوون رێباز بۆ خورتێن كورد پەروەر، لەوا كوردێن عيراقێ رێز و ڤەدرگرتنەكا مەزن بو سەيدا جەگەرخوين گرتن مان صبرى بۆتانى دبێژت:"ل پێشيێ جەگەرخوين هات مووسل ل ئوتێلائێكى ئەرمەنى دنڤست چەكدارەك دگەل دا بوو، ژبۆ خزمەت و پاراستنا وى".

پاشى سەيدايێ جەگەرخوين بەر ب بەغدا پايتەخت چوويە، راستەرێ بەرێ خودايە ئێزگا كوردى، ل وێ دوو بەرنامە پێشكێش كرنە ئێك تاريخى بوو، يێ دى ئەدەبى بوو.

ل سالا1959 ل سەرەراێى خزمەتا سەيدا ل ئێزگێ كوردى، سەيدايێ جەگەرخوين دبە يەكەمين مامۆستا ل زانكوا بەغدا، بەشێ زمانێ كوردى كوليژا پەروەردێ، سەيدا دەرس ب شاگردێن كورد دايە، ژبەر رۆلێ سەيدا يێ زانستى ل كوليژێ زانكوا بەغدا دەستێ هاريكارێى پێشكێشى سەيدا كريە ژبو چاپكرنا سێ پرتوكێن وى يێن زانستى ئەوژى ئێك(ئاوا و دەستورا زمانێ كوردى) و يادى پرتۆكا (فەرهەنگا كوردى) جلدێ ئێكێ و دووێ بوون. كو ل سالێن1961-1962 چاپ بوونە، شاگردێن كورد زۆر مفا ژڤان پرتوكا وەرگرتنە و تا نهۆ گرنگترين ژێدەرن د پەرتۆكخانا

کوردیدا.

پشتی کو رژێما عیراقێ سۆز و پەیمانێن خوە بجە نەنینان بەرامبەر دۆزا مللەتێ کورد ل سالا 1961 ئلگرێ پیرۆزێ شورەشا ئیلونا مەزن دەستپێکر. ل سەرانسەری کوردستانێ ب سەرۆکاتیا سەرورێ مللەتێ کورد ئەمر مستەفا بارزانی گوڤەند جاردی ل چیاییێن کوردستانێ خوەش بوو.

ل سالا1962 رژێما عیراقێ سەیدایێ جەگەرخوێن دەستەسەرکر، پاشی ب دیلی داڤ رژێما سوریا. ژنوو سەیدا دکەڤە بەر ئەشکەنجە و لێدانێ و ئەخووشیا.

ل سالا 1969 سەیدا جاردی خوە دگەهینت ناڤ ریزێن شورەشا کوردی بابێ من بخوە دیتی یە ل بارەگایێ شەهیدێ ئەمر عیسی سوار ل ئەرمشتێ. ل سالا1973 سەیدا ژبەر ستەمکاریا رژێما سوری دچت لبنانێ ل ور دمینە تا سالا 1975. مینا سەیدا صبری بوتانی دگۆت خەلکێ چیایێ دروژ مینا شورەشگێر و خەباتکەرەک کورد پێشوازی لێ کریە، بها و ریزێن مەزن بۆ گرتن، تایبەتی بنەمالا سولتان پاشا ئەترەش.

سەیدایێ رێزدار جەگەرخوین ئەو فرسەت ل دەست ئەدایە ل وێرێ دیوانا خودیا ب ناڤ و دەنگ(کیمە ئەز) چاپ کریە، دەربارەی دەربەدەریا خوە سەیدا دبێژت:"دوژمنێ مللەتێ کورد دخوازن من ژ مللەت، یان مللەتێ کورد ژ من دوور بخن لێ هەو دکارن".

بەلێ سەیدا ل چ باروذوخ دا ژیابا دەربەدەر با هەژار با ل چ جهێ هەبا کورد و کوردستان و ئەڤینا مللەت و وەلات هەروهەر دناڤ دلێ وی یێ بریندارادا دژیا.

بەلێ چ ژ داد یان ژ بێداد سەیدا جەگەرخوین ئەچار دبە ل سالا 1979 ژ دۆزەخا وەلاتێن ناڤەراست بازدە ودچیت ناڤ وەلاتێ سوێد جهێ ئازادی و دیموکراتیێ بختەوەر دبە، ل وێرێ ئاکنجی دبیت.

ل سالێن1979-1984 سەیدایێ جەگەرخوین ژ ناڤ ریزێن دۆزەخا دوژمنێن وەلاتێ خوە دەردچە، دکەڤە زیندانا دەربەدەریێ.

ل دەربەدەریێ ژ نوو عشقا وەلات جان و جەگەرا سەیدا پاتنە، بیروباوەریێن وی ب دۆزا کوردی موکم تر بوونە، ژنوو سەیدا دکەڤە خەباتەک بێ راوەستان دگەل جەند هەڤالێن مینا خوە دلبرین و کوردپەروەر شورەشەک ئەدەبی رەوشەنبیری و کولتوری ل ئەورووپا سازکرن. ژوان ئەنیستیتوا کوردی ل پاریس.

ل سالا1983 جەگەرخوین دبە ئەندامێ ئەنیستیتوا کوردی ل ور سەیدا دیوانێن خوە (رۆناك) و(زەند ئاڤێستا) و(شەفەق) و(هیڤی) ل دەربەدەریێ چاپ کرنە و ژ مللەت و وەلات را کرنە دیاری.

دیسا سەیدا پێتر ژ(40) ئافراندنا ل پاش خوە هێلانە ژوان تاریخا کورد ب شەش جلدا تا نهۆ دوو بەرگ ژێ هاتنە چاپکرن یێن دی ژی ل ریزێ نە ل هیڤی یە دیتنا رۆژێ نە.

بەلێ ئەو دلێ مینا دەریا پر هیڤی و ئومێد تێدا دژیان مخابن ئەو ب کول و دەردێن خوەڤە چۆبن ئاخێ ل شەڤا21/22-10/1984.

رۆناکبیرێ مللەتێ کورد سەیدا جەگەرخوین دبە شەهیدێ ئێش و ئازارێن مللەتێ خوە، ل وەلاتێ دەربەدەریێ دوور ژ کوردستانەک ئازاد خاترا خوە خواست جۆ ئۆغرا خوە با پیرۆز. پشتی کو83 سال بوارندین دل بخوین و بریندار.

ل رۆژا 1984/11/2 هەمی کوردێن ئەورووپا و نوێنەرێن پارت و رێکخراوێن کوردی ل سوێد جەمیان و سلاڤا دوماهیێ ل سەیداکرن.

ل سەر داخوازا سەیدا جەنازێ وی ژ ئەورووپا بەر ب کوردستانا سوریێ ئانین. مللەتێ کورد ل سوریێ ب کچ و کور ب مەزن و زاروک ڤە ب هەمی چینێن مللەتی ڤە ب دەستەکێن گول و کولزار ڤە پێشوازیەك دل حەبین و مەزن و ب چاڤێن هێستر ڤە ل جەنازێ سەیدایێ مللەتێ کورد کرن. دروشمێ جەماوەرێ کورد ئەڤ بوو:"جەگەرخوین ئەمرە، جەگەرخوین نامرت".

ل سەر وەسیەتا سەیدا جەنازێ وی ل باغچێ مالا وی ل قامشلوا خستن دناڤ گورا وی یا پر گولاڤ دا.

داخواز ژ جەگەرخوین چ یە؟

هەر چەندە جەگەر بۆ کەزەب ب کارتێ"لێ حارا ب داخوازا دل ژێ کوردا بکارنینایە مینا گوتنا مە تو جان و جەگەرا منی" یانی جان و دلێ منی. پاشێ جەگەرخوین بوویە بەرزترین ناسناڤ بۆ هوزانڤانەك کورد.

سەیدا ب داخوازا دل بکارنینایە نە کەزەب، یانی دل بخوین، دل بریندار. ب خوە ب دوو رێنڤیسا دهێت نڤێسین:"جەگەرخوین- Cegerxwn "-"جگەرخوین- Cigerxwn

—ئەڤ ناڤێ پیرۆز سەیدا ژ دیوانا رۆناکبیرێ کوردپەروەر"ئەحمەدێ خانی" "مەم و زین" تا دێرین و ئاقدار وەرگرتیە ژ فەلسەفا ڤینا بژونا مەمۆ بۆ زینێ هاتیە دەمێ بەکرۆکا شەهەر ل دل جەبینا وان کری و هەردوو دلبریندار بوونە ژ بەر ڤینا خوە ب هیڤیا خوە شاد نەبووین.

سەیدا ژی دڤینا خوەدا بۆ وەلات مینا مەم و زین بوویە ژ ئەنجامێ ستەمکاریا ل سەر گەل و وەلات دلبرین بوویە و بوویە جەگەرخوین.

چمە سەیدا بوویە جەگەرخوین؟

خوێیایە کو هەتا نهۆ چەرخا فەلەکێ چەپ ل مە زڤریە، زۆرداریەك مەزن ل مە کریە، دگەل مە ب کەرب و کین بوویە، لەوا مللەتێ کورد ژیانەك بندەست و هەژار تا نهۆ بەهرا وی بوویە، ژ کێمترین مافێ خوە وەك ئەتەوە هاتیە بێ بەهر کرن ل ناڤ تەڤایا ئەتەوێن جیهانێ‌دا.

لەوا ئەم دشێین بێژن کو چەند ئەگەرێن گشتی و هندەك بۆیەرێن هۆڤاتی ب سەر مللەتێ کورد دا هاتنە، وژدانا سەیدا هەژاندنە و جان و دل لێ سوتنە ژ ئەنجامێ وی دلبرین بوویە، بوویە جەگەرخوێن!!

جا دابزانن ئەو ئەگەر و رویدان و بۆیەر چنە؟!

I. تەحلیا دەردێ ئەزانین و ئەخوەندەواری ل ناڤ مللەتێ کورد، ئەو ئێشا بوویە پەنجەشێر دناڤ مەدە، مینا سەیدا دبێژت:

أ. دەردێ مەیە خوەندن و زانین

خورتێن خوەندەڤان، تەڤ بوون جەگەرخوین

- - -

ب. ئەو کەسێ بێ خوەندن و ئەقل و زانین

ل رێزا کەرایە چ ب دین و چ بێ دین

...

ج- ئەز دخوینم دلبرین سەیدایێ من جەگەرخوین
خواندەوارم پەهلەوان، بژی بژی کوردستان

...

د- والله بووم جەگەرخوین ژ دەردێ کوردێ نەزان
هەرچی دبێژی کوردم، گوه بدن بەر مەقالی

2. ئەڤینا وەلات، دلداریا کوردستان، رندی و جوانیا وێ کەتیە جانێ سەیدا، چکو رۆمەت و سەربلندیا مرۆڤ گرێدایە ب ئازادیا ئاخا مرۆڤی ڤە، مینا دبێژت:

أ- وەلاتێ مەیە، خوەشە کوردستان
زۆزان و دەشتەم تەڤ باغ و بستان
ڤەنجە خرابە، وەلاتێ مەیە
ب مە پر خوەشە وەك باغێ ئیرەم

...

ب- بێ وەلات بێ خەلات ئەم چ نە کوردنو
بێ جڤات بێ خەبات ئەم چ نە کوردنو

...

بێ خەلیج و بێ فرات، بێ جزیر و بێ قەلات
بێ سەرا و بێ کەلات، ئەم چ نە کوردنو

...

ج- ئاگر ب کوردستانێ کەت لەورا دکت هازارە دل
سەد باغ و سەد بستانی کەت ما نەدی بلبل ژارە دل

3. زولم و زۆرداری و ستەمکاریا بەگ و ئاغا و داگیرکەرا ل سەر کورد و کوردستانێ، هۆڤاتی و تالان و وێرانکرنا گەل و وەلات و کارێن وان یێن بەد و خراب، مینا سەیدا دبێژت:

أ- زولی بێگانە دبینم وا ل خاکی توو دبی
شەهرەتێ داوە دعالم مەن جەگەرخوینێ تەمە

...

ب- ما ئەز نە ژبەر دەردێ وان بوومە جەگەرخوێن
ئەڤ دەردێ ل ناڤ کورد وەکی ژانە د جانە

...

ج- ئاغا و بەگان دەستێ ستم دانایە سەروان دخوازی
تالان کەر و دز و کەلەش و بێ سەر و پانە

4. ژ دەردێ وان کەسێن ب ناڤ شێخ و مەلا تەڤ دناڤ کوردادا، مینا سەیدا دبێژت:

أ- نفرینەکێ ژ یەزدان دکم توو بێژی ئامین
شێخ و مەلایێ کوردان بەلنگاز و گەدا بین

...

ب- دەستێ شێخ ماچی مەکن ئەو شێخ نە ڤوتبێ رازی یە
تاج و شەوکەت تەڤ خەباتە دەستێ سار و تازی یە

...

ج- والە بووم جەگەرخوین ژ دەردێ شێخ و سەیدا
ڤەلەم دگەل زمانم هەردەم ب ئاخ و نالین

5. دووبەندانێ ، کەرب و کین ژ هەڤ، بێ تفاقی، بێ سەروەری، بێ رێبەری، نە ئێك گرتن ل ناڤ جڤاکا مللەتێ کورد، مینا سەیدا دبێژت:

أ- یەکێتی دڤێ بەری هەر تشتی بۆ کورد
چ زازا و کورمانج چ کەلهۆر و لورە

...

ب- بێ یەکێتی ئەم دژین
لەورە ئەم بوون جەگەرخوین

...

ج- مللەتێ کورد هەر تنێ مایە ل دنێ بێ سەری
بەس یەکێتی تێدە نینە هەر عشیرەك سەد کەری

6. بندەستیا وەلات، بێ تاج و تەختیا کوردان، خاپاندا مللەتێ کورد ب دەستێ کولەداران، مینا سەیدا دبێژت:

أ- تە ئەم خاپاندن جڤاتا رەنگین
ژ دەستێ تە ئەم گشت بوویە غەمگین
نە ئەز ب تەنێ کورد تەڤ جەگەرخوین

..

ب- من دڤێت ئۆل و بەخت، من دڤێ پێشقەچوون
من دڤێت تاج و تەخت، من دڤێ سەرخوەبوون

..

ج- جەگەرخوین تم دبێژی سەربەستیێ دخوازی
دڤێ رە کریە گوری، مال و جانێ خوە وی تەڤ

7. ب گەشەبوونا تیرۆژا شورەشا شێخ سعید پیرانی هیڤیەك دکەڤە دلێ سەیدا.

ب ڤی رەنگی بوویە رەوشا مللەتێ کورد ب دەستێ ترکو، ئەوژی سێدارەدان و کوشتن و تالان و سوتن بوو، جا جاوا دلێ سەیدا برندار دل بخوین نەبت، لەوما گوتی یە:

والله بووم جەگەرخوین، دەردێ من پر گرانە
ژ هەردوو چاڤێ من خوین، وەك زاب و دجلە دەربوون

8. ل سالا 1925 بۆیەرەك(حادسە) هۆڤاتی و بەربەری روو ددت ل رۆژا جەژنا نەورۆزێ، ئەوژی رژێما بەربەری یا ڤاشی ل کوردستانا باکور ل بازێرێ ئامەد(47) خورت ژ کورێن مللەتێ کورد ل سێدارێ دان ل پێش چاڤێن مللەتی ب ئاشکرایی، ئەڤێ رویدانا هۆڤانە جاردی دلێ سەیدا بریندار کریە.

ب سووند و سۆز و پەیمان رابوون دگەل ڤی شاهی
ب دەنگ و تیر و هالان، نێرش دەبنە ترکو

لێ مخابن جاردی هیڤی یا دلێ سەیدا شین نەبوو، پشتی دوو سال ژ داستانێن ڤارەمانی و مێرانی، دوژمنا ئەڤ ڤارەمانە و چەند مێرخاسێن هەڤالی وی دیل دکە پاشی شێخ سعید و هەڤالێن وی ل سێدارێ دان، ئەڤ روودانا نە مرۆڤانە داخەك دی دخت دلێ سەیدا مینا دبێژت.

وان شێخ سعید ئەفەندی گرتن، د جەژنە رۆژێ
گەلەك مەزن دگەل وی خستن شەریتێ یارو

پاشی لەشکرێ ترکو دکەڤە کوژتنا پیروکال و ژن و زارویێن کوردا، بێ ئینساف و بێ وژدان وان دکوژی مینا سەیدا دبێژێ:

گازی دکن یەزدانی یارەب خودێ تو زانی
ئەم مانە زارۆ مەحرۆم، بێ مال و مێر و زارۆ

9. پشتی شورەشا شێخ سەعیدێ بەهشتی ب سالەکێ، حاجۆ ئاغا ل سالا 1926 ز لەپ

هەلانینەك بچووك چێكر، دژی رژێما تورانی و زورداریا وان ل سەر مللەتێ كورد، دیسا لەشكرێ تركو ل گوندێ(نالقەمش) د حەوشا ئاغێ دە(2432) كورد ژن و مێرزار و مەزن پیرو كال كومكرن هەمی كوشتن و ئاگر بەردانێ.

سەیدایێ جەگەرخوێن دبێژت:"من ب چاڤێ سەرێ خوە ژنەك دی كو هەر بتنێ ژبەر سنگوا پارستی مابوو، لێ خوین ژ پشتا وێ دهات".

هۆزانا دل شەوات و دلبرین بناڤێ(پیرا تورێ) پێ ڤەهاندیە و دبێژت:

هلكشیمە چوومە ژورێ هەردوو رەخ من بەند و رەز

من دی پیرەك تێ ژ تۆرێ كەر د بەردە تێ ب لەز

--

هاتە نێزیك رۆژ بخێرەك داو وەك من دل ب خەم

پیرە پیر بوو پۆر-سپی بوو- تاڤی رەش بوو روو گەوەز

--

من ژ پیرێ خوەش د پرسی ئەی مەتێ تو ژ كووڤە تێ

گو ژ سێرتێ دچمە بێرتی، خوینا رۆمێ مە ئەز

--

خان و ئەیوان كرنە وێران مێر و ژن سەر ژێكرن

من گو پیرێ ڤەی تو كوردی؟ چوویە تلیێن خوە ب گەز

--

بەلكی بەندا رەز ب گوە بت، دەنگێ خوە پر هلمەكە

پر دترسم ئەز ژ دەردێ سنگوویێ رۆما تەرەس

گەلۆ چاوا ب ڤان رودانێن هۆڤاتی ل سەر مللەتێ كورد جان و جەگەرا سەیدا نەسۆژت و جەرگ و مێلاك لێ نەحەلن.

10- ژین و ژیانا سەیدا بخوە ژینا بێ دایی و باب ژینا ب ئێتیم سێوی، هەژاری و بەلنگازی، بێ خودانی، دەربەدەری، رێنجیەری، شڤانی، پالەی، ژینەك دلبرین و دل بخەمە، تاكو گەهشتیە ژیانەك تەحل و تال، خوە دناڤ مرۆڤادا وەك شێتا دبینیت مینا دبێژت:

چما راستی دبێژم ل ناڤ دینا بوومە دین

هەتا بمرم ژ نوو ڤە خەلك تێ بێژن جەگەرخوین

ژڤان ئەگەر و بویەرێن حێبەتی و هۆڤاری تەحلاتیا ژیانێ شێخ مووسێ حەساری ناڤێ خوەو ناسناڤێ خوە د هۆزان و دیوانێن خوەدا كریە(جەگەرخوین) یانی دل بریندارێ كورد و كوردستان دلشەواتێ وەلات و مللەت.

سەرچاوە: گۆڤاری(پەیڤ)، ژمارە(22)، گۆڤاری یەكێتی نوسەرانی كورد لقی دهۆك



# او ئو دەستورا زمانی کوردی

جگەرخوێن

## ئاخافتن(کلام)

. ئاخاڤتن: (٣) پەرچەیە:

١. سادە

. ئاخاڤتنا سادە ئەوە کۆ ژ پەیڤەکە سادە پێکبیٚ. وەك:

. بارام چو. فەرهاد هات.

. شێرین نان خوار. نەسرین نان دخوی...

دڤردە:– ئاخاڤتن سادەیە. ژبەرکۆ هەر تەنیٚ ژ پەیڤەکە سادە پێك هاتییە.

٢. تیکەلٚ:

. ئاخاڤتنا تێکەلٚ ئەوە کۆ ژ چەند گۆتن و پەیڤا تێکەلٚ دبی وەك:

. روستەم بفرۆکە ژ ئەربیل هاتە مال.

دڤردە:. ئاخاڤتن تێکەلٚە. ژ چەند پەیڤا پێك هاتییە وەك:

. روستەم

. بفرۆکە

. ژ ئەربیل

. هاتە، مال....

روستەم دەستپێکە. هات سالۆخە. ئەڤیٚ هەمی خوەپێگرن.

٣. ریزە:

. رێزە ئەوە کۆ ژ چەند پەیڤێن خوە سەر بئالیکاریا تیپا پێوەند گهابن هەڤ. وەك:

. یارام نان دخوی ئو فەرهاد دکەنی ئو شێرین تەشییٚ درێسی

دڤردە:. چەند پەیڤێن سەرب خوە بئالیکاریا تیپا پێوەند رێز بئونە:

. بارام نان دخوی

. فەرهاد دکەنی

. شێرین تەشییٚ درێسی...

پەیڤ - الجملة

- پەیڤ ئەو چەند گۆتنیٚ کۆ دورستە مرۆڤ ل داویا وان راوەستی، ژ بەرکۆ داخوازیٚ پێك تێنن. وەك:

بارام چۆ زاخۆ

فەرهاد سوار بو

شێرین هاتە مال

نەسرین گەور و بۆزە...

دڤان چەند پەیڤا دە دورستە کۆ مرۆڤ ل داویا وان راوەستی ژ بەرکۆ داخواز پێك هاتییە.

. ژڤان چەند پەیڤا رەتیٚ گۆتن پەیڤێن تەکوز.

. پەیڤا نەتەکوز ئەوە کۆ نە دورستە مرۆڤ ل داویا ویٚ راوەستی ژ بەر کۆ داخواز نەپێك هاتییە. وەك:

بارامیٚ سۆر...

شێرینا چاڤ بەلەك....

ژبەرکۆ داخواز پێك نەهاتییە. سالۆخ دپەیڤیٚ دەکێمە نکارن بێژن:

. ئەڤ پەیڤ تەکوزن ئو نکارن لەداویا وان راوەستن.

. ژ بەرکۆ دپەیڤیٚ دەدو پەرچیٚ بنیادی هەنە کۆ بیٚ وان پەیڤ تەکوز نابی:

١. دەستپێکراو...

٢. سالۆخ

چاواکۆ دپەیڤیٚدە، هن پەرچەیٚ دی ژی هەنە کۆ نەبنیادی نە لیٚ خوە پێگرتینە.

ژبۆ ڤی ئاوای گەرەکە ئەم پەیڤیٚ دور و درێژ ژهەڤ ڤەوەژێرن:

١. دەستپییکراو:

دەستپێکراو. ئەو پەرچە ناڤە کۆ هەردەم گەرەکە دپێشیا پەیڤیٚ دە ژیٚ بیٚ سالۆخدان. وەك:

| | | | |
|---|---|---|---|
| بارام | نان | خوار | |
| بارام | نان | خواریە | |
| بارام | نان | دخوار | |
| بارام | نان | خوا ربو | |
| بارام | نان | دکرب | خوارا |
| بارام | نان | دخوی | |
| بارام | دیٚ | نان | بخوی... |

دڤان تەڤادە(بارام) ناڤە. دەستپێکراوە. دپێش دەهاتییە ژیٚ سالۆخ دان....

. دەستپێکراوە، ژ بەرکو دپێش دەدەست پیٚ هاتییە کرن.

. ناڤە، ژ بەرکۆ کەسەکی بناڤدکی.

. ژیٚ هاتییە سالۆخدان، ژبەرکۆ ژوی پەیڤ تێکرن ئو وی ئەڤ کارکریە. وی نان خواریە...

## ئەوژی

١. دورستە(کرۆك)بی: وەك:

. بارام نان خواریە

دڤردە. (بارام) کرۆکە. ناڤە. دەسپێکراوە. ژبەرکۆ وی(نان) خواریە. وی ئەڤ کارکریە.

. (نان) پێکراوە. ژبەرکۆ ئەو هاتییە خوارن ئەڤ کار بوی هاتییە کرن.

. (خواریە) کرنا دور بۆرییە. (ژیدەریٚ) ویٚ(خوارن)ە ئەڤ(خوارن) ژ کرۆك ژ(بارام) چوییەسەر(نان). نەڤ(کرن) تیپەرە. دەرباسە.

. کرن ئو پێکراو ب هەڤرە سالۆخن ژ دەستپێکراو رە.

٢. دورسته(پیکراو)بی: وەك:

. بارام هات کوشتن. کوژرا

. نان هات خوارن. خورا

دڤردەـ(بارام) ئو (نان) دەستپێکراون - ناڤن پێکراون، شونا(کروك) ستاندنەـ گرتنە. ژ بەرکو(کروك) نە پەندییە. ژپێکراو هاتییە سالۆخدان.

. با ژ هەڤ ڤەوەژێرن:

(بارام) دەستپێکراوە. ناڤە. پێکراوە.

(هات) کوشتن کرنا بۆری نەپەندییە ژ دەستپێکراو رە سالۆخە.

وەها رەنگە(نان) ژی ولۆیە.

٣. دورستە کۆ هەر تەنها(ناڤ)بی وەك:

. گول سۆرە. گیا کەسکە...

شێرین گەورە. فەرهاد رەشە...

دڤردە. هەر تەنها دەستپێکراو ناڤە. نە(کروك) ئونەپێکراوە

٤. دورستە کۆ(بەرناڤ) بی. وەك:

. ئەو سۆرە. ئەڤ گەورە...

. ئەم جوانە. ئەو پیرە...

دڤردە. هەر تەنها(بەرناڤە). نەکروك ئو نە پێکراوە ئو نەناڤە (ناڤ) ژی:

١. دورستە(پەسن)بی وەك:

رە نگێ گولێ جوانە

سواریا شێرۆ باشە.

تۆز ل فەرهاد نەمایە....

٢. دورستە کۆ(ژمار)بی. وەك:

. دو سالن ئەز دەرڤە مە

. سێ مرۆڤ ژوێ دەتێن

. سەد(مێ) ل بن سیا دارەکێ مەغەل تێن..

٣. دورستەکۆ(پالڤەدار)بی. وەك:

. مەهینا فەرهاد بەزایە

. چێلەکا شێرین ب شیرە

. کەڤۆکا گولچین خوەشکە...

٤. دورستە کۆ(بالڤدان)بی وەك:

. خانی وەلات پارێزەکی مەزنە

کۆی مللەت پەروەرەکی گەورەیە.

. جەزیری هۆزانەکی ناڤدارە.

. نالی بوێژیکی بناو بانگە..

٢.(سالۆخ)

. پەرچێ دوەم ژ پەیڤێ سالۆخە:

. سالۆخ ئەوپەرچەیە کوڵ پەی دەستپیکراو تێ، ئوبوی د کارن ژ دەستپێکراو سالۆخ بدن. وەك:

. شێرکۆ ب مێرانی دەنگ دایە.

. بارزان چیاکی بلند و بەرزەیە.

. شێرکۆ ناڤە. دەستپێکراوە.

. دایە کرنا دور بۆرییە.

ـدەنگ پێکراوە.

. ب مێرانی راکێش ئو راکێشراون.

پێکڤە سالۆخن ژ بۆ شێرکۆ.

.(سالۆخ) ژی

١. دبی(کرن)بی .(پەیڤ)بی: وەك:

. بارام شیرانی(خوار)...

٢. دبی(ناڤ)بی: وەك:

. روستەم گەرناسە...

٣. دبی راکیش ئو راکیشراوبن. وەك:

. فەرهاد ل مالە...

دڤردە. (کرن) وندایە. هەریەك ل گۆرا داخوازاخوە دکاری ببێژی.

٣. (خوەپیگر)

. خوە پێگر ئەو پەرچەیە کۆ دپەیڤیدەیان:

(١). خوە پیگرێ دەستپیکراوە وەك:

. شێرینا(خەبات کەر) باشە

. ئەوا(خەبات کەر) باشە

. فەرهادێ(گەرناس) مێرە

. ئەوێ(گەرناس) مێرە

(٢). یان خوە پیگرێ سالۆخە

. ئەوژی:

١. یان رەوشا کارەکی نیشان ددی. وەك:

. شێرکۆ(ب سواری) ئاژۆتە سەر دژمن.

دڤردە. (ب سواری) رەوشا ئاژۆتنا شێرکۆ ددی زانین.

٢. یان دەمەك نیشان ددی. وەك:

. فەرزەندە(پار) ژ خوەندە گەهێ دەرچو.

. (پار) دەمەك ددی زانین.

٣. یان جهەك نیشان ددی. وەك:

. بۆرۆ ژ(زاخۆ) تێ.

. (زاخۆ) جهەك ددی زانین.

٤. یاسەبۆنی نیشان ددی. وەك:

. سالار (ژبۆ) خەبات هاتی یەڤرا.

. (ژبوخبات) سەبۆنییەك ددی زانین.

٥. یان ئالیکارییەك نیشان ددی. وەك:

. بەرهۆ(ب گولە) دژمنێ خوە کوشت.

. (ب گولە) ئالیکارییەك ددی زانین.

٦. یان چەندییەك نیشان ددی. وەك:

. شێرو(چار جارا) کەتیە زندانێ.

. (چار جار) چەندییەك دایە زانین.

(٣)، يان خوه پیگریێ پیکراوه وەك:

. بارام روستەمیێ گەرناس کوشت.

. (گەرناس) خەوەپێگریێ روستەم ئو روستەم ژی، پێکراوه ژبوٚ بارام. (کوشتن) ژ بارام تیێ پەریه سەر روستەم.

(٤)، یان خوه پیگریێ پیگره وەك:

. هەسپیێ قەمەریێ تاری دبەزیێ دەرکەت.

. بارامیێ هوزانیێ مەزن مروڤەکی باشه.

. ئەویێ ریٚزانیێ مەزن پیاویٚکی گەورەیه.

دڤردە. (تاری) ئو(مەزن) خوەپێگریێ خوه پێگرن. یانی پەسنیێ پەسنیێ دەستپیٚکراون.

ئاورەك:

. (جی دەم) ئز(جی گە) ئو راکیٚش و راکیٚشراو خوه ب(کرنیێ ڤەدگرن) . خوه ب سالوٚخ ڤەدگرن.

(٢)ـ (گوٚتن)ـ (کلمه)

گوتن ئەو پەرچەیه کوٚژیەکیێ بیٚتر پەیڤەکیێ پیٚك تیٚنی وەك:

. شیٚروٚ رازایه

. سالار ژ چوٚلیٚ تیێ

. بارام ل خوندەگهیێ دخوینی.... .

دڤردە شیٚروٚ گوٚتنەکه. رازایه گوٚتنەکه. ب هەڤرە پەیڤەك پیٚك ئانینه.

(سالار، ژ، چوٚلیٚ، تیێ) چار گوٚتن ب هەڤ رە پەیڤەك پیٚك ئانینه.

. (بارام، ل، خوەندەگەهیێ، دخوینی) چار گوٚتن ب هەڤرە پەیڤەك پیٚك ئانینه.

. (گوٚتن) ژی:

١. یان ژ کارتەکیێ پیٚك تیێ وەك:

ئاو، ئارد، ئاش، ئاخ، ئەل.... ....

گوٚشت، گوٚرن، گوٚند ...

٢. یان ژ دو کارتا پیٚك تیێ وەك:

. باژار، باران، بارزان، بالان ....

٣. یان ژ سیێ کارتا پیٚك تیێ.

. بریڤا، سلیڤا، (رە، وان، دون) ...

٤. یان ژ چار کارتا پیٚك تیێ وەك:

. رامەژاندن، راڤەتاندن، راکشاندن، هلفراندن، هلقەتاندن

٥. یان ژ پیٚنج کارتا پیٚك تیێ وەك:

. بدارڤەکرن، ب ژوٚرڤه برن

٦. یان ژ شەش کارتا پیٚك تیێ وەك:

. ب هەڤ گوهەراندن ...

ئاورەك:

ئەڤ ژێدەریێ رەقەم٤-٥-٦ چیٚکروٚخن. ئەبنیادی ئە(راکیٚش و راکیٚشراو) تیٚکەلێ بونه ....

(کارت)

. ژهەر دەنگەکی رە کارەتەك تیێ گوٚتن:

. ئەوژی:

١. جارنا ژ یەك تیپیێ پیٚك تیێ وەك: (ئا)

٢. جارنا ژ دو تیپا پیٚك تیێ. وەك: (با)

٣. جارنا ژ سیێ تیپا پیٚك تیێ. وەك: (بار)

٤. جارنا ژ چار تیپا پیٚك تیێ. وەك: (کوشت)

. گوٚتن سیێ پەرچەیه:

١. ناڤ

٢. کرن

٣. تیپ

اـ ناڤ (الاسم)

. (ناڤ) ئەو گوٚتنه کوٚ سەر ب خوه داخوازیێ ددی زانین ئو دەم ئو کروٚك ژیٚره ئەگەرەکن. وەك:

. بارام، خەسروٚ، فەرهاد، شیٚرکوٚ ....

. شارەزور، ئەربیل، موش، وان .... .

. ئاڤ، دار، بەر، با .... .

. شیٚر، شور، مار، موٚر، چوٚك ...

. ناڤ٣٣ سیو سیێ پەرچەیه:

ژریێ ڤە(ناڤ) دوپشکه:

١. تەکناڤ (اسم الخاص)

٢. بیش ناڤ (اسم الجنس)

(١)ـ تەکناڤ:

. تەکناڤ ئەوەکوٚ هەر تەنیێ مروڤەکی یان تەیاکی، یان تشتەکی بناڤ دکی، وەك:

بارام، شیٚرین، خەسروٚ، شیٚرکوٚ، سیپان، هەولیٚر، دهوٚك، شارەزور، ئەرزەروٚم....

ئەوژی:

١. یا راستە ناڤە: وەك:

. بارام، شیٚرین، سیفوٚ، سەیدوٚ، شیٚرکوٚ، بوٚزوٚ .... .

٢. یا ب پەسنەکی خوه تیێ ناڤ دان. وەك:

. گەوریێ، ئازدار، پەریشان، شیٚرین .... .

٣. یان ب مالباتا خوەتیێ ناڤ دان. وەك:

. بدرخانی، بابانی، حەیدری...

٤. یان ب شونەکیێ تیێ ناڤدان. وەك:

. قزلجی، ئامدی، شارەزوری، حسکەفی ... .

٥. یان ئالاڤەك دگەل تیێ وەك:

. کوردستان، ئەرمەنستان، هندستان .... .

٦. یان ب کارەکی خوه تیێ ناڤدان. وەك:

. باغڤان، توتن چی، بەربەر، سم تەراش...

(٢)ـ بیش ناڤ: یا(بوٚش ناڤ) . (اسم الجنس)

پیٚش ناڤ ئەوە کوٚ یاپیٚشەك مروڤ، یا پیشەك تەبا، یا پیشەك تشت بدی بناڤ کرن. ودکارن وی ناڤی ل تەك تەکیێ وان بکن.

وەك:

. چیا، دار، بەر مروڤ، هوڤ، شێر، شور، شەنگ، شوخ، شال .... .

. دەشت، کەو، قاز، قولنك، پسیك، مێر، ژن، پیاو، کەچ، کور، لاو ..... .

هەر وەکو ناڤێ(چیا) هاتییە دانین ژ بۆ هەمو چیا رە و لۆ دکارن ژ یەکیەکێ چیا رە بکن ناڤ .... .

. وەها رەنگە ئەڤێ دی ژی ولۆنە .... .

. دیسا ناڤ دو پەرچەیە:

١. سادە ناڤ (بسیط)

٢. پارچیم ناڤ (مرکب)

(٣). سادە ناڤ، یاناڤێ سادە

ئەوەکۆ سەربخوە داخوازێ بدی زانین. وەك:

. ئبراهیم، شێرۆ، رەز، پەز، دار، مزگین، شێرین، هاڤین، پاییز، گول .... .

هەریەك ژڤا ناڤا سربخوە بێ کۆ ناڤەکی دی دگەل بێ داخوازێ ددن زانین.

(٤). پارچیم ناڤ

ئەوە کۆ ژناڤەکی بێتر بهەڤە پەرچیم بونە و داخوازێ بهەڤرە ددن زانین. وەك:

. ئەردەشێر، شەرەف خان، ئەزدین شێر، بەدرخان، بارام گۆر، بەزدی گۆرد .... .

. ئەوژی وەکۆ خویا دکی:

١. یا دو ناڤن وەك:

. بدرخان، گرداهۆل، ئەرزەرۆم، شارەزور .... .



# جەگەرخوین

نووسین: دلدار شەکو
گۆڕینی لە لاتینییەوە: کەریم چولی

ئەڤ هەلبەستڤانێ کورد یێ هەری ناڤداریێ سەد سالا بیستان، "جەگەر خوین" د سالا "١٩٠٣" ئاندە لدەڤەرا "مێردینێ" لگوندێ "حەساری" کو سەر بناڤچەیا "کەر جوسی" ڤەیە ژ دایك بویە، ئەڤ ناڤچە پشتی گوهەرێنین سیاسی- ئەردنیگاری د سالا ١٩٨٦ ئاندە بسەر پارێزگەها "باتمانی" ڤە دهێتە گرێدان.

د ئەنجاما هەژاریو بەلەنگازیو هنەکی ژی زور داریا دەولەتا تورك دە، دگەلێ خێزانا خوە ژواریێ باڤو باپیران ب یەك جاری بار دکنو دچن باشوریێ خورئاڤاییێ وەلێتو لناڤچەیا "ئامودیێ" ئاکنجی دبن.

پشتی کێشانا گەلەك کێفەراتو پەریشانییێ، د هەژدە سالیا خوەدە، ل مەدرەسەیێن کوردی دەست بە خوەندنا ئاینی دکە، ژ ڤێ قوناغێ وپێدە ((جگەرخوین)) ئێدی فەقەیە و هەروسا بەدرێژاهیا خوەندەڤانیا خوە گەلەك مەدرەسە و دەڤەرێن کوردستانێ دگەرە، هەر کو دگەرە بچاڤەك زیندی ولاتێ خوە دناسەو دبە بینەرێ گەلەك رویدانێن ئەرەوا کو گەلێ وی ژ دەست دوژمنو کەڤنە پەرستان دبینە.

ژڤێ قوناغێو پێدە، وەکو ئەو ژی د هەلبەستا خوە یا بناڤێ "کورتە ژینا من" دە دبێژە ژیانا وی دهێتە گوهەرتن.

"ژینا من یا کەڤنارە ئێدی هاتە گوهەرتن ئەڤ خوەشیو زانە بوون هەفت، هەشت سالان هن بهن"

دڤردە دڤێت بهێتە دیار کرن کو دوی سەردەمی دە مەزنترین چاڤ کانی یان ژی وارگەهێن ئافراندنا هەستێ نەتەوی مەدرەسێن کوردی بوون. دڤێ پێڤاژویا ژیانا خەوە دە"جەگەر خوین" برێیا خوەندنو گەریانا ل وەلێت، وەکو لسەری ژی مەدا خویا کرن، ژیانا کوردیا بندەست دبینە، دوژمنێن ژنانا نەتەوا خوە "چ دڤەری، چ ناڤخوی" چاك دناسەو روژ بروژ هەستی نەتەوی لجەم وی مەزنترو بلندتر دبە، هەر جهەکێ کو دهەرێ ئاشنای رەوشەنبیرو سیاسەتمەدارێن دەڤەرێ دبە.

((من دەست بکوردێی کر، پەیدا کرن چەند مرید

بخوەش خوانو رەش بەلەك، خاسما پشتی شێخ سەید))

ناڤێ وی یێ زکماکی "شێخ موس حەسەن"ە وەکی ئەو ژی د هەلبەستا خوەیا بناڤێ "بکورتی ژینا من" دە دخویاکرن کو پشتی چونا مەدرەسێ ب سالەکێ دەست برستنا هەلبەستێ کرییە، دەربارێ گەریانا خوە یا ل وەلێت، د هەلبەستا خوەدە وسا دبێژە:

((پاشێ چومە ئیراقێ، ژوێ ئەز چومە ئیران

هەچی کەسێ بریما ژمن دمانە حەیران

بەری سالا رەحمەتی بچار سالان دلبرین

د سرێدە ناڤێ خوە من داتانی جەگەر خوین))

دڤێ مالکا داویدە دگەل مێژوا دەست پێکرنا هەلبەستڤانیا خوە، مێژوا راکرنا ناز ناڤێ "جەگەر خوین" ژی ددەخویا کرن، "بەری سالا ب چار سالان"

بەری هەلاویستانا شێخ "سعید" ب چار سالان "١٩٢٢" بد لە کێ پڕ ئیش و بریندار دەست بهەلبەستێ کرییەو دگەل هەلاویستنا شێخ سعید ناز ناڤێ "جەگەر خوین" د هەلبەستێن خوە دە بکار ئانییە.

## هەلبەستێن جەگەرخوین

تشتەکی سروشتییە کو هەر مرۆڤەكو دگەل کو دەربارێ هەمی وارێن ژیانی د خەبتە ژی، لێ دواریێ بەشەکی ژیانێدە، سەر دەستو سەر کەفتیە، گافا ئەم ل ژیانا هەلبەستڤانانو ل ناڤەڕوکا هەلبەستێن وان تەماشا دکین، دهێتە دیتن کو هەر یەكو د بابەتەکێ دەو لدوڤ تێگە هشتنا خوە یا دواریێ ژیانێدە هەلبەستێن خوە رستنەو هەر لدوڤ وێ تێگە هشتنا خوە هەستو داخوازێن خوە ئانینە زمێن.

لێ دڤێ واریدە جەگەر خوین هەم جودایە، هەم ژی هەمە رەنگە، هەمەرەنگە چونکو دەست هاڤێژتییە هەمی لایەنێن جڤاکێو د هەلبەستێن خوە دە بدەستەی بکار ئانییە، ژواریێ سیاسی بگرە هەتا ب فەلسەفەیا ژیانێ، د هەمی واراندە ب شێوەیەکی هەری بەر فرەه دەست کاری کرییە. ژ بۆ رەوشەنبیرو سیاسەتمەداران بۆ دەرگەو پێشەواییێن کومەلێن کوردی، ژبۆ ئایندارو خوە دێ نەناسان، هەلبەستێن سیاسی ژی بو گوندیو بەلەنگازان، هەلبەستێن راپەرینێ ژبو زارۆکان خورتان، کەچان، سرۆ دێن نەتەوەیو یۆرشی، بکوتایی ژ بو ئازادییا گەلو ژ بو رزگاریا ولاتێ خوە بەردەوام نڤیسییە، د ئەڤ گەرا گەلێ خوە دە بشیرەتو ئامۆژگارییێن خوە وەکی "پیرەکی موضی" بەشدارییی کرییە.

ژ بلی ئامۆژگارییو شیرەتان د هەلبەستێن وی دە، گلی، گازنەو رەخنەیێن توند ژی کو ئاراستەی هەمی لایەنێن جڤاکا کوردی نە، بشێوەیەکی هەری بەر فرەه ببەر چاڤ دکەڤن.

دەست پێکا سالێن ١٩٦٠ ئاندە، بەشداری "شورە شا ئێلۆنێ" د بە پاشێ د

سالا ١٩٦٧ ئاندە دگەل کومەك ڕەوشەنبیرێن کورد ئێن ناسراو ماوەی دەمەکێ، د کۆڕێ زانیاری کوردی دە دخەبتە.

راستە "جەگەر خوین" بەرهەمێن خوە بکورمانجیا ژوورین نڤێسییە، لێ گەلەك هەلبەستێن وی بکورمانجیا ژێرین ژی هەنە.

## بەرهەمێن جەگەرخوین

بەری چاپکرنێ یەکەمین جار هەلبەستێن وی د گۆڤارا "هاوار"ێ دە دەرچونە، لێ بەری وەشانا هەلبەستێن وی د گوڤارا "هاوار"ێ دە برنگێ دەست نڤێسکیو برێیا مەدرەسەیێن کوردی لگەلەك دەڤەرێ کوردستانێ هاتبوون بەلاڤکرن. بەرهەمێن وی یێن کو هاتنە چاپکرن "تەمەت کو ئەز دزانم" ئەڤن.

| | |
|---|---|
| ١-ئاگرو پەرووشك | هەلبەست |
| ٢-سەورا ئازادی | هەلبەست |
| ٣-کیمە ئەز | هەلبەست |
| ٤-رووناك | هەلبەست |
| ٥-زەند-ئاڤەستا | هەلبەست |
| ٦-شەفەق | هەلبەست |
| ٧-هێڤی | هەلبەست |
| ٨-ئاشتی | هەلبەست |
| ٩-سالارو مدیا | هەلبەست |
| ١٠-شەرەف ناما مەن زور | هەلبەست |
| ١١-ڕەشۆیی داری | چیروك |
| ١٢-تاریخا کوردو کوردستان | لێکۆلین |

د ئەنجاما رابوراندنا تەمەنەکی دەر بدەر، بێسەرو بەر "لێ برۆمەت" دە هەلبەستڤانێ کوردێ ناڤدار (جەگەر خوین) وەك تەڤا یا ئەندامێن نەتەوا خوا ژ دەست زورداریو چاڤسوریا دەولەتا (سوری) ناکە درو د سالا ١٩٧٧ دە ژ بو دەرچونا دەرڤەی وەلێت دچە"شامێ" پاشێ دچە "لوبنان"و د سالا ١٩٧٩ دە ژڤر بەر ب "سوێدێ" ڤە بو جارا داوی ڕەوانە دبە.

ئێدی جەگەر خوین ل ولاتەکی بیانی بیانییە، ئێدی جەگەر خوین دوری ئەو ئەڤینا خوە یا پیروز، دوری وێ خوەشیا خوە یا نازدار کو بدرێژیا تەمەنێ خوە د بەردە کەفتار دبوو ئازار کێشابوو، ژیانا خوە یامای د دومینەو درو ژ ٢٢/جوتمەها/١٩٨٤ ئاندە ئاگرێ کە سەرو جودا هێی گیانی وی یێ نازدارو لاواز بوی سەرا سەر، رادپێچەو لباژارێ (ستوکهولمی) بو جارا داوی چاڤێن خوە دگرە. لێ زاروکێن وەلاتێ روژێ وەفادارن، وەکو د هەمی سەردەمێن نارەوایێن مێژوییێ دە ل هەمبەری جەگەر خوینێ وەلاتێ خوە بجوشە کە بێ پیڤان وەفا داریا خوە نیشاندان. ب بەشداریا هە ژمارەکە بێ هەژمار یا مروڤان تەرمێ وی گەهاندن "قامیشلو"و ل وێ دەرێ ئەو ژێر گل کرن.



# جەگەرخوێن دیتنا تە ماکەسەر

سگڤان عەبدوحەکیم

دخازم ئەی دلو ژارو بچاکی هەری میریّ وەلاتیّ مەتوّراکی بیّژە ئەی شەهیدیّن دین و مللەت بەسە رابن سەریّ رۆژامە دەرکەت لمیّر دینا رەنگین و لگوندیّ حساریّ چاڤێت خو بڤیّ دونیا بیّ سوز ڤەکرن وەك سەیدایێ هیّژا دبیّژیّت:

سالا هزار و نەهەد وسیّ ئەز هاتمە دونیایێ بناڤیّ شیّخ موسی ئەز چیّبومە ژدایێ باب لیّ مرهڤ تازارو بوّ و دەیکیّ دا دویفرا وەك هیّژایێ ئەمر دبیّژیت دایکا منا بەلنگاز پیّنجی سالی و دلوڤان ئەو ژی پشتی سالەکی لبابیّ من بوّ میّهڤان ژینا خو بقەقاتی و شفانی و گاڤانی بوراند و بشتی شورە شا پیران دل تڕژی خویّن بوو ناڤیّ خودانی جەگەرخویّن و قیرین و هاواریّن ئەمریّ هیّژا هەرداخازا خویّندنیّ دکر.. چنکو دزانی خویندن ریّکە بوّ پیّشی کەفتنا مللەتیّ هەژار و خام و هزرا خوّ ترخان کردا بەرەڤانیێ ژ فەقیر و بەلنگازا بکەت و بنەشکرا و میّرانی دژی دەرەبەگا ستەم کارا هەتا دگەهیتە سەرمایەداران و گەلەجارا تان و پەرژان د پژکاندندا هیڤی و خەونا وەلاتیّ خو بگەهینتە عەسمانیّ حەفتیّ بەلیّ.. گوهبدەن

ئەڤ رەنج و ستەم ل من سەراسەر
سیە سالە ژبوّ وە بومە رەنجبەر
خوران وجی و جلك ژ جەم من
بوّچی ژ مەرادین بە دژمن؟
هەم رۆژو شەڤان مەسەر نەکرخەو
هەرچی ژمە هات مەکر، مەبیّ تەو
دەنگیّ مە بوکو بەریّ تەدار ژەد
ایدی چە دڤیّ ژمن؟ نەمەك کوّر!

هەلبەت جەژناکوردا ژ ببرا سەیدایێ هیّژا قەت نەچویە چنکی هەروهەرڤە دگیّرا و کاری گەلەك هوّزانین خوّ بگەهینتە مەزنترین و خوشترین گەوری لکوردستانیّ

نەوروز و بهارەبەربی گولو دارە
دەستم بدەست یارە بیّهنیّ گولیّ هارە
نەوروز و سەر سالە لیّڤا گولیّ ئالە
وەك چیچك و لالە سور و زەرو کالە
نەوروز و مزگینە کەسك و زەرشینە
بهار بە نگینە حالیّ چ رەنگینە
نەوروز خوش با تیّ بیّهنا کولیلکاتیّ
خوم خوم ژ چەماتیّ سونبل بسەماتیّ

و چەند و چەند بخوینی ژیّ تیّر نابی و تیّهنامە ناشکینت

چنکی چ بابەت نەمایە هەکە تیّدا شەهرەزا و مەلەڤان نەبیت ژ بەر هندیّ ئەم دکارین بیژین مەزنبو و نازا بوو سویارەك زانابو سەر هەسپیّ کاروانیّ هوّزان و زمانی کوردییی شرین و مللەت مە شەهنازیّن و سەر بلندیێ پیّدکەت و خوکرە نیشانەك گەش بو ڤی مللەتیّ بداخ و کوڤانیّت ویّ مری.. جوانی و سروشت و دیمەن پیّشی چاڤا بون و ئەڤینداری و دلوڤانی گیانیّ وی دلەرزاند وەرن بخوینن:

یار وەك کەڤوکاخوش کە دی
سەر بەستە بیّ شەرم و فەدی
خو لپەنجەرا عەشقیّ نەدی
ماتو بویّ دینیّ چکی
تاوەك جەگەر خویّن دین نەبت
ئەڤین ددلدا شین نەبت
تەحلی بتە شرین نەبت
ما تیّ بزا نینیّ چکی
دا قەستا ناشوبا جوانییّ بکەین

و خوّنیّزیکی رەندە کچەکا کورد بکەین چنکی ئاشوب و راستی لجەم جەگەر خویّنی مەزن هەر ئیّکە و هەر ریّکە کە:

گاڤا سەحەر رابی ژ خەو
بسکان لسەر دیّمان ڤەکە
نەینك لسەر ماسا سەدەڤ
زولف و گریّی بەندان شەکە
جەنەتابدەستیّ تەییّ سپی
زیّر و بازنان جەنگ و شەرە
و خویندن بەراهیکا ئارمانج و داخازیّن
سەیدایێئەمر بوّ وەك مە گوتی
دەرمانیّمەیەخویندن و زانین
خورتیّتخوندەڤان رەنگی جەگەر خوین

براستی خام و قەلەم و تورەڤانەك وەك من قەت و قەت نکاوت لسەڤی هوّزانڤانیّ مەزن ژ دل بنڤیسیت چنکو مەسترە ژ هەمی خاما مەسترە ژ هەمی هزرا هەما هوّزانین ڤی مەزنی بەرسڤا هەمی پسیارانە و نڤشتوکیّن وی سەیرانا هەمی هوّزانڤان و رەوشەنبیرانە.. مادیّ چ بیّژین و چ نڤیسین هەکە مەگوهدا:

ئەی فەلەك فەلەك زالم فەلەك
کا کورد ستان کابورجا بەلەك

هەتا دگەهیتە:

ئەڤ هزار سالە تە ئەم کرین عبید
و ئەم خاپاندین بیّ وەعد وەعید
وەلاتیّ مەیە کوردستانە
زوزان و دەشت تەڤ باغ و بیستان
قەنجە خرابە وەلاتیّ مەیە
بمە پر خوشە وەك باغیّ ئیرەم

ل١٩٨٤/١٠/٢٢ ستیّراگەش رژیا و رویباریّ هوّزانا کوردی هشك و زوها بوّ پشتی ئەڤ نڤشتوکە هیّلاین بوّ مللەتیّ خو وەك خەلاتەکی پربها و نەرخ:

١. دیوانا ئیّکیٰ١٩٤٥ پشتی هینگی ئاڤدانا پریك وبیّتی
٢. جیم و گول بەری١٩٤٧ چیروّك

٣. دیوانا دویٚ ناڤدانا شورەشا ئازادیێ١٩٥٤
٤. رەشوێی داری١٩٥٦چیروك
٥. گوتنیٚ پێشتا١٩٥٨بەند
٦. اواودەستورا زمانیٚ كوردی١٩٦١
٧. فەرهەنگا كوردی(١)١٩٦٢
٨. فەرهەنگا كوردی(٢)١٩٦٢
٩. زەند و ئەڤیستا
١٠. روناك هۆزان
١١. كیمە ئەز هۆزان

دارشتنا پەیڤا لنك سەیدایێ نەمر بساناهی بوو قورس بو یانكو وەك دبێژنی(السهل الممتنع) و كومكرنا وی بۆ دیروك و ناڤ و نیشانێت ئازادخازا دناڤ هۆزانادا رەنگەك نویدا هۆزانا كوردی هەر وەسا شیانەك بهێز چاند دناڤ رەنگ و ناڤەروكێدا و هەلبژارتنا وی بو هندەك بابەتێن نوی مێرخازیەك بوو قەهرەمانی بو ساڤە و نەمرەد ناڤ دلێ مەدا و دلێ مللەتیٚ خۆدا.. شاگردێن تە بسوزن و خوگرتنی برێكا پێش كەفتنێدا و قەت خوسست خاف ناكەن بەلێ بیٚ ریمەتی و سالسكی..دا پیرا تۆریٚ بخوێنین.

## پیر انۆریٚ

هل كشیمە چۆمە ژۆریٚ
هەر دو رەخ من بەند و رەز
من دی پیرەك تیٚ ژ تۆریٚ
كەر د بەردە تێت بلەز
پیرەبی بۆ پۆر سپی بۆ
تاقی رەش بو رۆ گەوەز
من ژ پیریٚ خوەش د پرسی
ئەی مەتیٚ تو ژ كویڤەتیٚ؟
گۆت ژ سێرتیٚ دچمە بێرتیٚ
خوینی یا رومیٚ مەئەز
خان و مان وێران كرن
مێر و ژن سەر ژیٚ كرن.
من دگۆ ئاغا و بەگ
ویٚ گۆت: كوڕیٚ من گوە مەدیٚ
ئەو شڤانن، سەرمیانن
دانە گوروان جوٚل و پەز
من گۆ: پیریٚ قەی تو كوردی؟
چۆیە تلیا خوە بگەز
بەلكی بەندا رەز بگوهبت
دەنگیٚ خوە پڕ هلمەكە
پڕ دترسم ئەز ژ دەربیٚ
سنگۆییٚ روما تەرەسی
من كوڕەك تەنیا هەیە
ئەو شاندی باژێر مەدرەسیٚ
وی دو سیٚ پرس بۆ مەگۆتن
پیٚ حەلاندن جەرك و بەز
گۆتی دایێ ئەم دخوینن
وەك جەگەرخوین گۆتیە
زۆ بخوینن هەڤ ببینن
بچنە كوردستان بلەز

## سەرچاوە

گۆڤاری(نوسەری كورد) ژمارە(١)خولی سێهەم ئاداری١٩٨٥

# Hendêk le honrawekani cigerxwin

## Kîme ez?

Kîme ez?
Kurdê Kurdistan
Tev şoreş û volqan
Tev dînamêt im
Agir û pet im
Sor im wek etûn
Agir giha qepsûn
Gava biteqim
Dinya dihejî
Ev pêt û agir
Dijmin dikujî
Kîme ez?

Ez im rojhilat
Tev birc û ketat
Tev bajar û gund
Tev zmar û lat
Ji destê dijmin:
Dijminê xwînxwar
Xurt û koledar
Ji rom, ji fireng
Di rojên pir teng
Bi kuştin û ceng
Parast, parast
Parast min ev rojhilat
Kîme ez?

## Rojhilatê nêzik

Rojhilatê navî
Ev bajar û gund
Ev bej û avî
Ket bin destê min
Pî da ser dijmin
Min bi ceng û şer
Zanîn û hiner
Pişta wî şikand
Serî lê gerand
Ez bûm padîşah
Xurt û serbilînd
Ketm destê min ta sînorê
Hind Kîme ez?
Kîme ez?

## Kurdê serf iraz

Dijminê dijmin
Dostê haştîxwaz
Ez xweş mirov im
Ne hirç û hov im
Lê çibkim bê şer
Dijmm naçî der
Bav û kalê mm
Dijîn tev serbest
Naxwazim. bijîm
Te ebed bindest
Kîme ez?

## Divê ez derxim

Dijminê xwînxar
Şahê efyûnkêş
Jontirkê dijwar
Serbest bijîm ez
Wek hevçaxê xwe
Dilxweş bîxum ez
Rez û baxê xwe
Çekan hilgirim derkevim meydan
Rêçek nû çêkim ji boyî însan
Kîme ez?

Ez im ê şikand leşkerê Rêşar
Min bi xwîna xwe parastî ev war
Di sînga dijmin ez bûme kelem
Xwe dan ber siya min Turk û Ecem
Li ser serê min
Sinbil û kulah
Serê hespê min
Digirt Padîşah
Ez im ew gernas
Ew Selahidîn
Bipirs ji dimyat
Bipirs ji Hetîn
Kîme ez?

## Ez im Erdeşîr

Ew Noşîrewan
Kesrayê mezin
Bi tac û eywan
Dostê kevnare
Ko bûne dijmin
Ser ditewandin
Ber agirê min
Ez im ew qelaş xurt û pehlewan
Xerac min distan ji Hind û Yewnan
Kîme ez?

Ez im gernas ez im ev mêrxas
Belê ez im Kurd
Yro ez mame
Bindest û zigurd
Ew tac û eywan
Tev çûn û rizîn
Dijmin nav û deng
Tev ji min dizîn
Xistin laşê min mîkrobên teres
Ta bûm perîşan bê nav û nekes
Kîme ez?

Ez im ew kurdê serhişk û hesin
Yro jî dijmin ji min ditirsin
Bîna barûdê
Kete pozê min
Dixwazim hawîr
Biteqim ji bin
Dîsa wek mêra
Bikevin çîya
Naxwazim bimrim
Dixwazim bigrim
Kurdistana xwe
Axa mîdîya
Kîme ez?

Kawey hesinker bav û kalê min
Perçiqand serê Zehakê dijmin
Ji gerdana kurd
Wî şikand zencîr
Serê me parast
Ji birîn û şûr
Roja hat kuştin xwînmijê dilsoz
Goya dibêjin: - Ew roj e nûroz
Zivistan diçî
Ew rojên ne xweş
Parêz dibî kurd
Ji dêwê zergeş
Wesan dibêjî Zerdeştê rêzan
Ehreman dişkê Hirmiz tê meydan
Kîme ez?

Ez im ê çêkir ev cejn û nûroz
Divê bistênim
Wilo nemênim
Bigrim tol û doz
Fermandar bim ez
Li ser Kurdistan
Bo min bimênin
Ev bax û bustan
Ev şax û ev deşt
Rez û şînahî
Bigrim destê xwe
Dil xoş û şahî
Zana û xwenda
Dezgevanên xurt
Vî warî bigrin
Bikin ronahî
Kîme ez? .

Ez im Kardox, Xaldêwê kevnar
Ez im ew Mîtan, Nayrî û Sobar
Ez im ew Lolo
Kardok - û Kudî
Ez im Mad û Goş
Horî û Gudî
Ez im Kurmanc û Kelhor, Lor û Gor
Ez im, ez Kurd im, lî jêr û jor
Çend hezar sal in
Kurdistana min
Perçe perçe ma
Bindestê dijmin
Kîme ez?

Iro ji Lor û Kelhor û Kurmanc

Ji dest xwe berdan ew text û ew tac
Bûne Olperest
Bi tizbî û xişt
Ta dijmin şikand
Li me ser û pişt
Me dan bin lingan dewlet û hebûn
Bûn dijminê hev perçe, perçe bûn
Ta ko Kurdistan
Ta ko Kurdistan
Jar û perîşan
Kete bin destan
Kîme ez?

Ez im ev milet ez im ejdeha
Ji xewa dîlî şîyar bûm niha
Dixwazim wek mêr
Dixwazim wek şêr
Serê xve hildim
Çi ser bilind im
Bi cîhan carek
Ez bidim zanîn
Rêçika Markîs
Rêçika Lenîn
Kurê Guhderz û Ferhad û Rustem
Kurê Salar û Şêrgoh û Deysem
Bejin bilind im
Wek Dêw bilind im
Ez dest dirêj im
Serbest dibêjim
Dixwazım bi lez
Gavan bavêjim
Kîme ez?

Ne xwînxwar im ez haştî xwaz im ez
Serdarê me ye gernas û nebez
Em şer naxvvazin
Divên wekhevî
Em paşve naçin
Dijmin direvî
Ji bo mirovan em tev dost û yar
Bijî Kurdistan bimrî koledar
Kîme ez?

## GULA RO-JHILATIM

Gula baxê bihiþta rojhilatim.
Di tarîya þevê rojim hilatim.
Ji nav singa demê piþkîme îro,
Di tarîxê fireh hatim, Feratim.
Hemî jînim, dixwazim xweþ vejînim,
Hezar û nehsedî þîn bûme katim.
Birûskim, pir çirûsk û hewr û tavan
Bi himhim têm, ji ezmanê welatim,
Lehîme ez di ser hev re diborim.
Dixwazim nû bikim rêz û civatim.
Birûsk û pêt û ar kevne sojim,
Ji pût û lat û lahût re þewatim.
Disojim lê dikim ronî þeva reþ
Çira kora ye ev kar û xebatin,
Di vê rê de ez dicim lê seg diqorin.
Fidakarim li ser rêça felatim.
Dixwazim ez di ser hev re bifûrim,
Xebatim, þoriþim, xweþ kêferatim.
Cîhan tev de wekî pingav û derya
Tenê jê re wekî cok û qenatim.
Bi daxwazim ko serbestî dixwazim
serbilindî.
Ji milet re di vê þabatê hatim.

## AZADÎX-WAZ IM

Tîp û lekên kurd ketin zinaran
Li hawîr bumba bû gullebaran
Êrîş dibin der komên neyaran
De rabe ser xwe, kurê min rabe!

Şev ta sipîdê me nîne qet xew
Cihan li ber me dibîte rew - rew
Nêrkew nexwenî, çi bêyî mêkew ?
De rabe ser xwe, kurê min rabe!

Bavê te çû şer, şêre li meydan
Êrîş dibin ser Îran û Tûran
Destên xwe dan hev kurmanc û dostan
De rabe ser xwe, kurê min rabe!

Kengî mezin bû, divêm bixwênî
Rewşa cîhanê tu xweş bibênî
Ji nû tu karî dijmin derênî
De rabe ser xwe, kurê min rabe!

Keç û kurên kurd hemî şîyarbin
Ji bo serbestî hemî li karbin
Ji hevre dostbin, dijê neyarbin
De rabe ser xwe, kurê min rabe!

Dijware dijmin, Tûran û Firse
Gernas û mêrbe, ji wan metirse
Sibê şiyarbû, li min mepirse
De rabe ser xwe, kurê min rabe!

Ji bo xweşbin dem û gevên te
Ezê sipîdê bighê bavê te
Bere ziwabin herdu çavên te
De rabe ser xwe, kurê min rabe!

Milên xwe bidme milên berane
Di şerda en tev xûşk û birane
Êrîş bikin em, lê şer girane
De rabe ser xwe, kurê min rabe!

Bizane, xwendin ji bo we derman
Da ku bizanin qanûn û ferman
Derxin ji dil em van tirs û şerman
De rabe ser xwe, kurê min rabe!

Destên xwe bidne destên çepên rom
Bibin partîzan bi leşker û kom
Carek metirsin ji "hok" û "fantom"
De rabe ser xwe, kurê min rabe!

Dibî bavê te di şerde bimrî
Zinhar kurê min nebî tu bigrî
Em têne kuştin ji bo tu nemrî
De rabe ser xwe, kurê min rabe!

Dijmin naçî der bi lav û gazê
Xwînê nerêjî naghê daxwazê
Siba diçim şer divêm tu razê
De rabe ser xwe, kurê min rabe!

Þêx û melan em tev kirne derwêş
Ev bû du sed sal, em bûne berbêş
Ba bêne kuştin, nemêni ev êş
De rabe ser xwe, kurê min rabe!

Şîn tê bi xwînê dara serbestî
Îdî naxwazin dîlî, bindestî
Ev êlperestî, ev olperestî
De rabe ser xwe, kurê min rabe!

Mirovperestim mîna Cigerxwîn
Serbest bijîn tev, ne wek "Mem" û "Zîn"
Jîna serbestî, divê me ev jîn
De rabe ser xwe, kurê min rabe!

(Cigerxwîn, Dîwana 7a, Hêvî)

## Ez gelek tî me

Şeraba wan lebên lala
Bi minde ez gelek tî me
Bila xêra te bî cana:
Nizanî ez çi birçîme?

Ji baxê paxil û sîngê
Eger sêvek bidî Seyda
Xurînî pê ku bişkînim
Diçim ser rê ku rêwîme

Eger sênca rez û baxan
Çirand û dest birin sêvan
Dibî lêv herne ser lêvan
Li min megre ku sêwîme

Bi tenha ez li çolême
Serî goka di holême
Birîndarim ji wan mijgan
Pêrîşanim çi xwînîme?

Welatperwer bî ey xanim:
Were dest deyne ser canim
Birînê min qemûşk bigrin

Bi jînê pir bi hêvîme

De wer maçek biminde xweş
Li dêm ko bisk bikin şevreş
Ku ayîna te bigrim ez
Ji nûve da bi zanîme?

Bihayê herdû sêvên zer
Li dil xistin te sed xencer
Mebîne qelsemêrim ez
Ji kurdên ser nişîvîme?

Kurê Xesro û Guhderzim
Di vê rêde gelek berzim
Evîndarim ku can û dil
Li ber destê te danîme

Eger ez ser dibim ber pê
Xwedana şal û îşerpê
Dixwazim ku tu pîroz bit
Di vê rê ez çi manîme?

Dema çavên te yên mêrkuj
Dibênim ez dibim wek mij
Peyala şerbeta lêvan
Kirim gawir ku yezdîme

Ji te dûrim te nabînim
Li ser te ez ciger xwînim
Çi bêjim ko nikarim bêm
Di îro ez swêdîme.

Stockholm 26.9.1979

© Cîgerxwîn
Aşitî - Dîwanaa 8a, Stockholm, 1985, 173 r.

## Mela banga sibê didî

Mela banga sibê didî
Dibê: ji xew rabin bese
Ev bû hezar sal kolene
Ta key di xewde bin, bese:

Li ser we tim zor û setem
Pingav û gol û ça û çem
Bahoz û serme û seqem
Ma win şiyar nabin, bese:

Malê me her bixwî neyar
Tim bêne me qamçî û dar
Bindest û birçî û hejar
Parsek jî wa nabin, bese:

Bindestê dijmin pir nexwe?
Li ser çiyan em bûn kele?
Qirdê me kor, bextê me re?
Ma hê jî ranabin, bese:

Welat xweşe tev xêr û bêr
Petrol û hasin, zîv û zêr
Bindestê dijmin tim li jêr
Ta kengî kolebin, bese:

Hetta nebin xwenda û jîr
Bê rêber û bê destegîr
Bê dewlet û rist û wezîr
Bindestê tirka bin, bese:

Dijmin Relek zana û xurt
Xwînxwar û devlok, har û sirt
Ta key bi xap û fort û zirt
Li ser me axa bin, bese:

Tev yên mene ev bax û dar
Deşt û çiya, lat û zinar
Em derketîne, bendewar
Lê ew di baxa bin, bese :

Ev xan û eywan û sera
Dijmin bixun mal û pera
Xweş têde rûnin, lê çira
Em tim li çola bin, bese:

Em tim ji derve dûrîdest
Birçî û tazî, jar û mest
Tim têne kuştin dest bi dest
Bin boks û dara bin, bese:

Dijmin ketin xanên bilind
Girtin ji ber me şar û gund
Lê em bikûrin rengê kund
Yan rengê zaxa bin, bese:

Daxwaz çiye ji serxebûn
Da em bixun mal û hebûn
Pê xweş bikin derdê derûn
Lê xurt û zana bin, bese:

Li ser çiyan nal û girîn
Guhdêre qîr û deng û şîn
Dîsa ciger tev bûye xwîn
Bin berf û serma bin, bese:

